# مارتن هایدگەر


نووسینی

مارتن هایدگەر

گی باسیت — میشیل هار

هانا ئارندت — یورگن هابرماس

رۆدۆلف ئەگستاین — گیۆرك فۆلڤ

وەرگێرانی بۆ كوردی

ئیسماعیل كوردە



چاپی یەكەم

٢٠٠٣





لەبڵاوكراوەكانی سەنتەری لێكۆڵینەوەی فیكریی ئەدەبی نما

زنجیرەی ( ١٩ )

ناوی كتێب: مارتن هایدگەر

نوسینی:

مارتن هایدگەر ، گی باسیت ، میشیل هار ،

هانا ئارندت، یۆرگن هابرماس،

رۆدلۆلف ئەگستاین ، كیۆرگ فۆلڤ

وەرگێرانی بۆكوردی: ئیسماعیل كوردە

پیت چنین: شاخەوان محەمەد

كاری هونەری : نما

تیراژ: ٥٠٠ دانە

چاپی یەكەم: كوردستان/ هەولێر ٢٠٠٣

# پێرست





مەیدانی بازاڕی " شیتاخ"

# کلاورۆژنه

کتێبی هایدگەر بەم شێوەیەی ئێستا لەبەردەستاندایە رای کۆمەڵێك بیرمەندە لەسەر تێزو فیکرو فەلسەفەی هایدگەر، کە بەشێوەیەکی رەخنە ئامێزەو جگە لەژیانی مارتن هایدگەر ، بیروبۆچوونی خودی خۆی لەسەر ژیان لەدارستانی رەش‌و کێشمەکێشمەکانی پەیوەندی بوونی بە( سۆسیال ناسیۆنالیستەکان)و مەسەلەی زانکۆی فرایبۆرگ‌و گفتوگۆ بەناوبانگەکەی گۆڤاری "شبیگل"ی لەخۆگرتووە ، جگە لەخۆی هەریەك لە( یۆرگن هابرماس‌و گی باست‌و هانا ئارندت‌ومیشیل هار) نوسین‌و رایان خستۆتەروو، شێوەی کتێبەکە وەك دۆسییەکی تایبەت وایە لەسەر فەیلەسوفی سەدەی بیستەمی ئەڵمانی..

بۆچی هایدگەر؟.. کوردو نێوەندە رۆشنبیریەکەی لەهەژاریدا پێویستی بەناساندنی هەموو فیکرو تێزێکی بێگانە هەیە بۆ ئەوەی لانی کەم شارەزایمان لەشێوەی بیرکردنەوەو هەلومەرج‌و قۆناغەکانی گەشەسەندن‌و



هوشیاری میللەتانی دوورو نزیکمان هەبێت. یان لەرێگای ناسینی فیکرەکانەوە وەکو ئەوەی هابرماس دەڵێت" دەشێ لەگەڵ هایگەردا دژی هایدگەر بیربکەینەوە" یان ناساندنێك کە لە رێگای فیکری هایدگەر بەشێوەیەکی دیکە بگەرێینەوە بۆ شارستانیەت‌و کەلتوورێکی گەورەی وەکو کەلتووری گریك. بەشێوەیەك کە تیایدا بلێین هایدگەرو شیعر وەك ئەوەی میشیل هار دەڵێت" قسەیەك دەکەن کە زمانی سادەی خەڵك پێیناوێرێت".. بۆیە بەو هیوایەین بمانتوانیبێت لەم کتێبەدا شتێك پێشکەش بە خوێنەری کورد بکەین..بەتایبەت کە ماوەیەکی زۆرە ئەم بابەتانە وەرگێڕدراون کە زیاتر لە ساڵێك دەبێت جگە لەوەی کە بابەتی ( چۆن لەگەڵ هایدگەر دژی هایدگەر بیربکەینەوە)ی "یورگن هابرماس" لەگۆڤاری نمای ژمارە (٤)دا بلاوکراوەتەوە..

لەلایەکی دیکەوە بێشك گەر هەر هەڵەیەکی زمانیشی تێدابێت‌و پێینەوێرابم، پێم خۆشە هاوکاریمان بکەن بۆئەوەی لەچاپەکانی ئایندەدا چاکی بکەینەوە، ئەوەش لەبەرچاو بگرین کە وەرگێران جگە لەوەی خیانەتێکە بەرامبەر بەنوسەر، جاریواش بەکوردی کردنی بابەتەکە هەندێ شت دەگۆرێت.

وەرگێر



مارتن هايدگەر



# ژيانى
# مارتن هايدگەر
# لەچەند دێڕێكدا

١٨٨٩: مارتن هايدگەر لە ٢٦ى سيبتمبەرى ئەم ساڵە لە "مسكيرچ "( MESSKIRCH) لەديك بووە . باوكى پياوێكى ئايينى كڵێسەى مارتن و ، دايكى ( يوهانا كامف JOHANNAKEMPF ) بوو لە خێزانێكى جوتيار بوو .

١٩٠٣: هايدگەر لەو ساڵەدا چووە پەيمانگاى كلاسيكى HumANISTISCHES GYMANASIUM لە " كۆنستانس ". لەوێدا لەسەر دەستى "سيباستيان هان SEBASTIANHAHN" فێرى زمانى ئينگليزى بوو ، كە دواتر لەباريەوە گوتى:" هيچ كەسێك لە زمانى يۆنانى پێى نەدەگەيشت"

١٩٠٦: لەو ساڵەدا هايدگەر خوێندنى ئامادەيى تەواو كردوو بڕوانامەى بەكەلۆريايى بەدەست هێنا . لەساڵى ١٩٠٧ بە راڤەكردنێك بۆ خوێندنەوەى ليكۆڵينەوەكەى

(فرانز برانتینو FRANZBRENT)(دەربارەی فرە چەمکی بۆ کائین لای ئەرستۆ تالیس ) دەستی پێکرد . ئەم خوێندنەوەیە سەرەتای پرسیارگەلێك بوو دەربارەی چەمکی (بوون) کە بەدرێژایی ژیانی، هایدگەر لەگەڵیدا تووشی پچڕان نەبوو .

١٩٠٩-١٩١١: لەسەرەتادا هایدگەر لەکۆلێژی لاهوتیو دواتر لەکۆلێژی زانست خوێندی . هەریەك لەباسکاڵpascal هیگل - HEGEL و نیتچە NIETZSCHSE و شیلینگ SCHELLINGو هۆسرل HuSSERL و دستۆفیسکی DOSTOJEskij و هۆڵدەرلین - HolDERLIN و ریلکە - RILKEو تراکل TRAKLی خوێند . تا وای لێهات هایدگەر بەدرێژایی ژیانی خوێنەری نوسەرە نوێگەرو گەورە نوسەرە کلاسیکیەکانی گریك بوو .

١٩١٥: هایدگەر وەك مامۆستای یاریدەدەر لەزانکۆی فرایبۆرگ دامەزرا .

١٩١٦: هۆسرل وەك مامۆستا لەهەمان زانکۆ دامەزراو داوای هایدگەری کرد بۆ خزمەتی زانستی ، بەلاَم بەبێ ئەوەی لە وانە گوتنەوەی زانکۆ بیچرێت.

١٩١٧: لەو ساڵەدا ژیانی هاوسەری لەگەڵ ( ئەلفریدە باتری -ELFRIEDEPETRI ) پێکهێنا کە خوێندکاری دەروونناسی هەمان زانکۆ بوو کە هایدگەر تیایدا دەیخوێند .

١٩٢٢: هایدگەر ماڵە لادێیەکەی لە"دارستانی رەش " دروست کرد. لەوێشەوە کتێبە بەناوبانگەکەی " (وجودو زەمەن )ی لەساڵی ١٩٢٦ تەواو کردوو پێشکەشی بەهۆسرل کرد .

١٩٢٣: هایدگەر بەمامۆستا لەزانکۆی ماربۆرگ دامەزرا ، کەتاوەکو ساڵی ١٩٢٨ تیایدا مایەوە .. ئەو کات ماربۆرگ گرنگترین سەنتەری کانتیەتی نوێ بوو لەئەوروپا .

١٩٢٧: لەو ساڵەدا (وجودو زەمەن zeit-uudsein دەرچوو کە بلیمەتی شۆرشگێڕانەی فەیلەسوفی لاو "مارتن هایدگەر"ی دەرخست . لەوکاتەوە بەتەواوەتی کانتیەتی نوێ تەقیەوەو فینۆمینۆلۆژیای رەوتی فەلسەفی " بەهێز تر بوو لەو سەدەیەی ئێستادا .

١٩٢٧-١٩٢٨: چەند وانەیەکی دەربارەی " عەقڵی تایبەت"ی کانت پێشکەش کرد :" فەلسەفە لەرێگای پێشکەوتنو گەورەیی گەشە ناکات. بەڵکو ئەو هەوڵەیە لە پێناو ئاشکراکردنی هەندێك لەمەسەلەی دیاریکراوو روونکردنەوەی - فەلسەفە- خەباتێکی سەربەخۆو ئازادو بنەڕەتیە بۆ بوونی بەشەری ، دژ بەو بەربەستەی کە بێگومان ناوەستێت لەبلاَوبوونەوە لەنێوخۆدا . هەموو ئەو رونکردنەوەیش هیچ شتێکی نوێ ناکاتەوە جگە لە کردنەوەی دەریچەیەکی نوێ .

١٩٢٨:هۆسرل خانەنشین بوو ، هایدگەر جێگای گرتەوە .

١٩٢٠: هایدگەر وانە بەناوبانگەکەی بەناوی " جەوهەری حەقیقەت " لەهەریەك لەزانكۆكانی "بریم"و"ماربۆرگ"و"فرایبۆرگ" گوتەوە. ئەو وانەیە قوڵبوونەوەیەك بوو بۆهەندێ فیکرە، کە لە ( وجودو زەمەن)دا هاتبوون. لەهەمان گاتی ئەو ساڵەدا هایدگەر کتێبی " خواوەندی گریکی " ی خوێندەوە . فالتر ئاف ئۆتۆ (walte.f.>otto ) ش تێڕامانو راڤەکردنی لەرەگەوە جیاوازی لەتێڕامانو راڤەکردنە "میتۆلۆژییە" کلاسیکیەکانی پێشکەش کرد.

١٩٣٣: هایدگەر بەسەرۆکی زانکۆی فرایبۆرگ دامەزرا .

١٩٣٤: هایدگەر دەستی لەپۆستی سەرۆکی زانکۆی فرایبۆرگ کێشایەوە .

١٩٣٤- ١٩٣٥: وانەیەکی دەربارەی هۆڵدەرلین گوتەوە .

١٩٣٥:هایدگەر وانە بەناوبانگەکەی بەناوی ( دەروازەیەك بۆ میتافیزیکا)گوتەوە .

لەهەمان ساڵدا وانەی " جەوهەری کاری هونەری " گوتەوە .

١٩٣٦: هایدگەر وانەی لەسەر هۆڵدەرلینو شیلینگ و نیتچە گوتەوە وانەکانی دەربارەی نیتچە تاوەکو ساڵی ١٩٤٠بەردەوام بوو .

١٩٤٤: هایدگەر بوو بەسەربازو پەیوەندی بەتابورێکی سەربازییەوە کرد کە بەدروستکردنی قەڵا هەڵدەستان لەسەر رووباری ( راین) . لەهەمان کاتدا بوو کە (فریتەز)ی برای لە (مسکرچ) ی زێدی خۆیان لەترسی بۆمبارانی فرۆکەکان، بەشاردنەوەی بەڵگە تایبەتیەکانی هایدگەر هەڵسا.

١٩٤٥: فریدریك تۆفارنیکی (fredrictowarnick) سەردانی هایدگەری کردووە ، کۆمەڵێك تێکستی (سارتەر - sarter)و ( مارلو بوانتی merleauponty ) و( ژان بۆفری- jeanbeaufret) بۆ هێنابوو . لەکاتی گەڕانەوەشی بۆ فەرەنسا ، نامەیەکی لەلایەن هایدگەرەوە بۆ سارتەر بردبوو لەنامەکەدا داوای لێ کردبوو بێتە "تۆدناوبرگ". کەچی سارتەر نەیتوانی سەردانی هایدگەر بکات تاوەکو ساڵی ١٩٥٢.

١٩٤٦: هایدگەر وانەیەکی بەناوی " شاعیران بۆ چی ؟ " وتەوە .

١٩٤٧: کتێبێکی بەناوی " پەیامێك دەربارەی مرۆیبوون " دەرچوو کە ئاراستەی ژان بۆ فریٚ کرابوو .

١٩٥١: هایدگەر وانەیەکی دەربارەی ئەم بابەتە گوتەوە: مانای چییە کە دەبێ بیربکەینەوە ؟

تیایدا وتی :

١-بیر، مەعریفەیەك وەك زانست بەرجەستەناکات .

٢-بیر حیکمەتێکی پراکتیکی بەرجەستە ناکات .

٣- بیر توانای کاری راستەوخۆمان پێ نابەخشێ .

١٩٥٣: هایدگەر لەشاری "میونخ" چەند وانەیەکی دەربارەی(تەکنیکی) گوتەوە.

١٩٥٥: هایدگەر یەکەم سەردانی بۆ فەرەنسا ئەنجام داو وانەیەکی بەناوی : فەلەسەفە چیە ؟" گوتەوە :" ئەو ڕێگایەی دەمەوێ ئاماژەی پێبدەم ئێستا ڕاستەوخۆ لەبەردەممانداییە. لەبەر ئەوەی کە لێمانیشەوە نزیکە، بۆیە ئێمە هەوڵێکی گەورە دەدەین بۆ ئەوەی بتوانین ئاشکرای بکەین. ئەگەر دۆزیشمانەوە ئەوا[١٢] ناتوانین بەبێ هاوکاریو بەدەنگەو هاتن بیخەینە سەر ڕێرەوەوە. لەمیانەی سەردانەکەی بۆ فەرەنسا بەهاوشانی هاوسەرەکەی سەردانی مۆزەخانەی (لوڤەر) و کۆشکی (ڤێرسا )ی‌کرد. هەروەك چاوی بە (رینە شار – char rene) ی شاعیرو (جۆرج براك -braque)ی نیگارکێش کەوت.

١٩٥٨:هایدگەر جارێکی دیکە سەردانی فەرەنسای کردو، لەزانکۆی "ئاکس ئاون برۆڤانس " وانەیەکی بەناونیشانی : " هیگل‌و گریك " گوتەوە .

١٩٥٩:بەبۆنەی یادی هەفتا ساڵەی لەدایك بوونی ، هایدگەر وەك هاولاتی شەرەفی زێدی خۆی (مسکیرش) شۆرەتی وەرگرت .

١٩٧٦: هایدگەر لە ٢٦/ مایۆ /ئایار لەفرایبۆرگ کۆچی دوایی کرد. " رنیە شار "ی‌شاعیر قەسیدەیەکی کورتی نوسی تیایدا دەڵێ:

ئەو بەیانییە هایدەگەر مرد .ئەو ڕۆژەی خەواندبوو ، کەلوپەلەکانی بۆ جێهێشتبوو کەچی تەنها دەستی بەکارەوە گرت .

ئەوە کۆستی بەردەوامە ..

ئەو شەوەش کرایەوە ..خۆشەویستیان سەر پشك کرد .



هایدگەر لەزێدی خۆی "مسکیرچ"نێژراو لەسەر گۆرەکەی نوسرا : "ڕۆیشتن بە ئاراستەی ئەستێرە، جگە لەمە هیچی تر نا".



# بەتەنها "دارستانی ڕەش" ئیلهامم پێ دەبەخشێ

**مارتن هایدگەر**

لە سیێبتمبەری ١٩٣٣دا ، ئەو کاتەی مارتن هایدگەر لە ٢١ ئیبریلدا بەراگری زانکۆی" فرایبۆرگ"دامەزرابوو (جاری یەکەم بەچەند ساڵێك بەر لەدامەزراندنی ئەو داوایەی پێشکەش کرابوو ) بۆ جاری دووەمیش پێشنیارێکی لەمەر دامەزراندنی بە مامۆستای پۆستی فەلسەفە لەزانکۆی بەرلین پێ گەیشت . لێرەدا دەقی ئەو ڕەتکردنەوەیە دەخەینە ڕوو، تەفسیری ڕەتکردنەوەی ئەو پێشنیارە لەلایەن هایدگەرەوە دەکەین کە تیایدا وەسفێکی شاعیری ورد دەبینین بۆ ماڵی لادێیی. واتە ئەو ماڵەی کە ماوەیەك بوو هایدگەر هۆگری ئیشکردن بووتیایداو بەشێکی زۆری شاکارە بەناوبانگەکەی "



وجود و زەمەن "ی zint und sein تێدا نووسی.
هەروەك وەسفێکی وردی دۆڵی ( تودناو todtnuu) "ی نزیك " فلد بارگ- feldberg "دەبینین کە ئەوجی هەرە بەرزی دارستنی ڕەشە ، ئەو شوێنەی کە بەهۆی ئارەزوومەندانی خلیسکانی سەر بەفر لەو ماوەیەدا ناوبانگی دەرکردبوو . هەروەها دەقەکە بەشێکی ژیانی خودی هایدگەری لەخۆ گرتووە. هەروەك جەخت لەسەر ڕەگ داکوتانی قوڵی دەکاتەوە لەدنیای جوتیاراندا، هەر لەدەرکەوتنیەوە، دەقەکە لەرادیۆ پەخش کرا، هەروەها ڕۆژنامەی نیوخۆی(سۆسیالی ناسیونالیستەکان- deralemanne) یش لەمارسی (١٩٣٤) دا بلاوی کردۆتەوە. واتە داوای دەست لەکارکێشانەوەی هایدگەر لەپۆستی راگری زانکۆی فرایبۆرگ.

لە هەڵدێرێکی سەختی سەر دۆڵێکی بەرز و قوڵ، لێرە لەباشوری دارستانی ڕەشدا لەبەرزی (١١٥٠م) .. ماڵێکی لادێیی بچووك هەیە ( ٦ تا ٧ ) مەترێکەو سەربانە نزمەکەی سێ ژوور دادەپۆشێ : موبەقێك لەهەمان کاتدا هۆڵێ گەورەو سەرەکییە ، ژووری نووستن ، ژوورێك کەوەك ئۆفیسی کارکردن بەکار دیێن. بەلێکترازاوی لەقۆلاییە بەرتەسکەکانی دۆلاییو لەسەر هەڵدێری بەرامبەرو سەختدا ، بە شێوەیەکی فرە کوخی سەربان لیژو گەورە بلاوبونەتەوە . بەدرێژایی هەڵدێرەکە لەوەرگاکان تا بەدارستانی (تەنوب)ی چڕ و کپ دەگات





بەرز بوونەتەوە. لەسەرووی هەموو ئەو دیمەنانەش ئاسمانی هاوینەی گەش باڵی کێشاوە ، لەئاسمانە روونەکشیدا هەلۆکان بەرزدەبنەوەو بازنەی گەورە گەورە دەکێشن. ئەوە دنیای کارکردنە کە چاوی گەشتیاران و رێبوارانی ئارەزوومەندی تێڕامان دەیبینن، من خۆم بەمانای وشە ناتوانم لەدیمەنە سروشتیەکانی دەوروبەرم قاڵ ببمەوە، من لەساتێك بۆ ساتێکی تر لەشەوەوە بۆ رۆژو لەبەدواییەکهاتنی وەرزەکاندا هەست بەگۆرانکارییەکان دەکەم. زلی چیاکان و پتەوی بەردە کۆنەکانی و، گەشەی لەسەرخۆی دارە تەنوبەکان و بەهای پرشنگداری گوڵزارەکان و چرپەی کارێزەکان لەشەوانی پاییزی دوورو درێژداو هەروەها سادەییەکی کپی مەودا بەفرینەکان ، هەموو ئەمانە لێرە لەبەرزاییەوە دێنە نێو ژیانی رۆژانەوە ، تێیدا کۆدەبنەوەو کەڵەکە دەبن و شەپۆڵ دەدەن . لەو ساتانە نا کەدەمانەوێ ساتەکانی قوڵبوونەوە لەخۆشی، یان ئەو ساتانەی تێرکردنی خودی دروستکراو بن ، بەڵکو تەنها لەو کاتەی بوونم لەحاڵەتی کارکردندایە ، تەنها کارکردنە ئاسۆ لەبەردەم واقیعی چیادا ئاوەڵادەکات . رێرەویشی بەرێکی لەنێو ئاڵوگۆڕەکانی دیمەنی سروشتدا بەردەوام دەبێت .

کاتێك لەشەوە قوڵەکانی زستان گەردەلولی بەفرین بەدەوری ماڵەکە دەتەقێتەوەو هەرچی لەو دەوروبەرەیە دایدەپۆشێ و هەموو شتێك لەگەڵ خۆی دەبات. ئەو کاتە



زەمەنی فەلەسەفە دەست پێدەکات . لەو کاتەشدا دەبێ پرسیارەکەی سادەو بنەڕەتی بێت . دارشتنەوەی هەر بیرۆکەیەك جگە لەوەی کەتوندو کۆتابێت ناتوانێ هەبێت . ئەو هەوڵەشی کە هێزی وشەکان پێویستیانە، دەبێ لە شێوەی خۆراگری ئەو دار تەنوبانە بێت کەلەبەرامبەر گەردەلوولدا چەقیون. کاری فەلسەفە دوور بەدوور وەك ئەوەی جۆرێکی دەگمەن بێت نایاتەدی، شوێنەکەشی لەنێو کاری جوتیاراندایە . کاتێك جوتیارێکی لاو داشقە قورسەکەی کە پڕە لەدار(زان) بارکراوە بەدرێژایی هەڵدێری سەخت و ترسناك بەئاراستەی لەبارچوونی رادەکێشێ ، کاتێکیش شوان بەهەنگاوی خەیاڵاوی و لەسەرخۆ مێگەلەکەی بەرەو لوتکە پاڵ دەنێ. کاتێکیش جوتیار لەژوورەکەیدا چیخ گەلێك کەبۆ بنمێچی خانووەکەی دەگونجێن کۆدەکاتەوە، ئەو کارەش هەمان شێوەیە. ئینتیما بۆ دونیای جوتیاران رەگەکەی لێرەدان. شارییەکان هەرچەندە دەستبەرداری لوتبەرزییەکانی دەبێت و. بەدرێژی یەکێك لەجوتیارەکان دەدوێنێ وادەزانێ لەگەڵ خەڵك تێکەڵ دەبن. کاتێك ئێواران لەساتەوەختی پشوداندا لەگەڵ جوتیاران لەسەر کورسیەکەی نزیك سۆپاکەو لەدەوری مێزکە دادەنیشم و لەوێ لە " سوچی میهرەبانییەوە herrgottswinke لەزۆربەی کاتەکاندا هەرگیز قسەیان لەگەڵ ناکەم، ئەوانیش هەروا. ئێمە لەبێ دەنگیدا نێرگلە دەکێشین. لەوانەیە ناوە وشەیەکمان لێ بچۆڕێ ، بابڵێین دار بڕین لەدارستانەکەدا بەرەو کۆتایی دەچێت.





(بانبانکە)ش شەوی رابردوو بەسەر کولانەی مریشەکەکانیداداو زۆربەیان لەبەین چوون. لەوانەشە بەیانی مانگاکە بزێت ، یان یەکێك لەدرواسێکان تووشی نەخۆشی بووە . ئینتیمای کاری دڵسۆزم بۆ (دارستانی رەش) و ئەو خەڵکانەی لێی دەژین رەگێکی زۆر کۆنی هەیە ، هیچ شتێکیش لەوەرزێری شەوابیو ئەڵمانی سویسریدا قەرەبوی ناکاتەوە. کەسی شاری کەدەیەوێ لەلادێدا نیشتەجێ بێت سەرلەنوێ دەژێتەوە ، بەلاّم دەربارەی من ، کارەکەی من ، لەلایەنی ئەو دونیایە، واتە لەچیاکانو نێو جوتیاراندا ئاراستەکەرە. ئێستا کارەکەم لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر وەستاوە، کاتی زۆر هەیە کە بۆ گفتوگۆ یان گەڕانو وانە بێژی تەرخان بکرێت یان بۆ خوێندن لەوێ ، لەکەناری چیادا (مەبەست فرایبۆرگ )ە. بەلاّم هەر کاتێك سەردەکەومو لەسەعاتەکانی یەکەمی گەیشتنم بۆ ماڵەوە، دنیای پرسیارە کۆنەکان دامدەگرێ . ئەمەش بەهەمان شێوە دەبێت کە بەجێم هێشتبوو . بە شێوەیەکی سادە خۆم وادەبینمەوە بەئاوازێکی تایبەت بۆ کارکردن ، هەرگیز لەقولاّییدا سەروەری یاسا شاراوەکانی نەبووم . هەندێ جار شارییەکان سەریان لەگۆشەگیری درێژخایەنی من لە چیاکانو لەنێوان جوتیاراندا سوڕدەمێنیو سەرسام دەبن. بەلاّم ئەو ژیانەی تێدا دەژیم گۆشەگیری نییە، بەڵکو تەنیاییە، لەشارە گەورەکانداو لەهەر شوێنێکی دیکە زیاترو ساناتر لەتوانای مرۆڤدایە گۆشەگیر بێت. کەچی ناتوانێت بەتەواوی تەنیا بێت . ئەمەو تەنیایی



نفوزێکی تەواو جیاوازی لەگەڵ "گۆشەگیرکردنمان " دا هەیە ، بەلاّم بەپێچەوانەوە ، ئەبێ هەموو ژیانمان بخەینە پاڵ جەوهەری شتەکانەوە . لێرە، واتە لەشار، دەتوانین ناوبانگێکی بەپەلە لەرێگەی رۆژنامەو گۆڤارەکاندا بەدەست بهێنین. ئەوەش ئەو رێگا بێگومانەیە بۆ خێرایی کەوتنە نێو خەرەندی بیرچوونەوە . بە پێچەوانەی ئەوەش. یادەوەری جوتیاران بێ لاوازی وەفایەکی سادەی تێدایە . دواجار ژنە جوتیارە پیرەکە لەوێ لەبەرزاییدا مرد. هەندێ جار قسەی لەگەڵ دەکردم. لەمیانەی ئەو قسانەشەوە چیرۆکە کۆنەکانی لادێ سەرلەنوێ دەردەکەوتنەوە، لە زمانە بەهێزو واتا بەخشەکەشیدا زۆر لە وشە کۆنەکان و ئەو پەندە زۆرانەی پاراستووە کە لەزمانی نوێدا ون بوونو لەتوانای گەنجانی ئەمرۆشدا نییە درك بەماناکانیان بکەن، لەساڵی رابردوودا کە چەندین هەفتەی تەواوم بەتەنیایی لەماڵەکەدا بەسەربرد، ئەوپیرەژنە تەمەن (٨٣) ساڵە بۆ چاوپێکەوتنم لەو هەڵدێرە سەختەوە سەرکەوت . وتی دەمەوێ لەوە دڵنیا بم کە هێشتا هەر لێرە ماویت ، لەوەش دڵنیا بم کە دزەکان لە بێ ئاگایی مندا هاتبن بۆئەوەی ماڵەکەم بدزن . شەوی مردنەکەی خۆی بە گفتوگۆ لەگەڵ خێزانەکەیدا بەسەر بردووە بەنێو سەعاتێك بەر لەماڵئاوای بۆ دنیاکەیتر، داوای لێکردبوون کە " سلاّو بە مامۆستا بگەێنن "، یادەوەرییەکی ئاوا بەڕای من بەنرخترە لەهەر رێپۆرتاژێك ئەگەر باشیش بێتو لەرۆژنامەیەکی





ناوداری جیهانیو دەربارەی فەلسەفە بانگەشە بۆ کراوەکەی من بێت .

دنیای شارەکان لەبەردەم مەترسیەکی گەورە دایە ، مەترسی ئەوەی ببێتە نێچیری بیدعەی بکوژ . جۆرە پەلەکردنێکی هەراسان کارو پڕ ژاوە ژاو و زۆر چالاکی هەبوو، کە پێدەچوو جارناجارێ جیهانی جوتیارانو شێوەی ژیانیانم فەرامۆش کردبێ . لێرەوە هەرشتێك تەنیاو زەروور بێت رەت دەکرێتەوە ، یان ئێمە لەسایەی مەودای شێوەیەکی تری دونیای جوتیاراندا دەمێنینەوەو زیاتر لەهەر کاتێکی دیکەی بەر لە ئێستاش بەیاسا تایبەتیەکەشیەوە وەلای دەنێینو لەوەش دەترسێین دەستی لێدەین بۆ ئەوەی دووچاری توندو تیژی نەکەینەوە ، ئەویش بەخستنە رووی بۆ زۆر بلێیی درۆزنانەی خاوەن ئەدەبەکان دەربارەی ئەو شتەی وجودی تایبەتی خەڵكو ئینتیمای وەرزێریك پێك دەهێنێ. جوتیار هەرگیز حەز بە پەلە کردنەی شارییەکان ناکاتو هەرگیز پێویستی پێ نییە . . بەڵام ئەوەی دەیەوێتو حەزی لێیەتی ، نیانیەکی شەرەفمەندانەیە بەرامبەر بوونی تایبەتی خۆی و بەرامبەر ئەوەی پەیوەندی پێوە هەیە. بەڵام لەم نێوەدا زۆرێك لەوانەی لەشارەکانەوەو ئەوانەی لەسەردانێکی راگوزەردا دێن، لەئارەزوومەندانی خلیسکانێی سەر بەفرەوە بگرە ئەمرۆ لەلادێیەك یان لەسوچێکی لادێیەکدا وا هەڵسو کەوت دەکەن وەك ئەوەی لە شوێنێکی کات بەسەر بردنی شارە گەورەکاندا بن، گاڵتەو



گەپ دەکەن. رەفتارێکی لەم چەشنەش لەشەوێکدا شتێك دەگۆڕێ کە دەیان ساڵ خوێندنی زانستی دەربارەی پێکهێنەرەکانی گەلێك یان دابونەریتەکەی لەئاستیدا دەستە وەستان دەبێت. باهەر گیانێکی لێبوردەوە بەرژەوەندییەکی ناراستەقینە لەگەڵ خەڵكدا وەلا بنێین ، با فێری رێزگرتن بین لەژیانی سەختو سادە لەوێ ، لەبەرزاییداو بەجددیو توندی مامەڵەی لەگەڵدا بکەین .

دواجار زانکۆی بەرلین کورسی فەلسەفەی خستە بەردەمم، لەبەر ئەم هۆیە شار بەجێدەهێڵم پەنا دەبەمە بەر ماڵی لادێیم و گوێ لەو قسانە دەگرم کە لەچیاکانو دارستانەکانو کوخەکاندا دەیکەن. لەهەمان کاتدا سەردانی هاوڕێ کۆنەکەم دەکەم کە جوتیارێکی حەفتاو پێنج ساڵەیە . ئەو خستنەرووەی لەرۆژنامەدا خوێندبوەوە ، چاوەڕێ دەکەیت چی بڵێت؟ بەهێمنیو بەڕوانینە بوێرەکانی کە هەلقولاوی چاوە رووتەکانیەتی لە چاوەکانم ورد دەبێتەوەو، بەداخراوی دەیهێلێتەوە ، دواتر بەتوندی دەستە وەفادارەکەی دەخاتە سەرشانمو بە شێوەیەکی نهێنی سەری رادەوەشێنی .. ئەمەش واتا ، نا ، نا هەرگیز !







ئادمۆند هوسرل



# هایدگەرو
# گەڕانەوە بۆ گریك

**گی باسیت**

ئەگەر ئێمە کتێبی دەربارەی هیرۆکلیتس- Heraklit کەوا شێوەیەکی تایبەتی گفتوگۆی لەگەڵ ( ئۆیگین فینك- eugenfink) هەبوو، وەلابنێین.. دەتوانین ئەوە کورت بکەینەوە کە هیچ دانراوێك لەدانراوەکانی دەرچووی سەردەمی ژیانی هایدگەر نابینین یان نییە بە سیفەتێکی تەواو بنەڕەتی تایبەتکرابێت بۆ لێکۆڵینەوە لە یەکێك لە فەیلەسوفەکانی گریك، هەتاوەکو دونس سکوتس Duns scouts وکانت kant و شلینگو schelling وهیگل Hegel یشو نیتچەش- Nietzsche هەمان چانسیان هەبووە. ئەو بێ سەروبەرییو کەموکورتیە دیارانە، لەوەشداکورت ناکرێتەوە کە لەهەموو کاتەکاندا گومان لەگەڕانەوە بۆ فیکری گریك بکەین. هەروەك

هایدگەر کتێبەکەی وجودوزەمەن-sein znd zeit ی دوای پێشکەشکردن بە هوسرل- Husserl بەدێریکی ئەفلاتون کردۆتەوەو دەستی پێ کردووە، هەروەك بیەوێت ئەوەمان بۆ دەربخات کە کێشەی وجودو زەمەن بەشێوەیەکی تەواوەکی لەلایەن فیکری گریکیەوە خراوەتەروو؟ لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر ئێمە تەنها لەو کتێبانەدا بمێنینەوە کە دەرچوون، دەبێ ئەو بڵێین کە " لێکۆڵینەوەو وانەکان" و" مەسەلەکان" بەدواداچوون لەسەر فەیلەسوفە گریکیەکان لەخۆ دەگرن، ئەمەش جەخت لەوە دەکاتەوە کە بەرامبەر بوونەوە لەگەڵ فیکری گریکی یەکێك لەتایبەتمەندیە بنەڕەتیەکان بووە لەفیکری هایدگەردا.

هێرۆکلیتس ، بارمیندس-Parmenides ،ئەنکسیمندریس-anaximander، ئەفلاتون -platon ،ئەرستۆتالیس -aristoteles ،پەروانەیەکە بەسەر "گەورەکاندا "کراوەتەوە ،بەلاّم ناوە ونەکان کێن ؟ زینون –zenon سۆفستاییەکان، رەواقیەکان، ئەبیکۆریەکان و ئەفلۆتین . ئاخۆ لەگەڵ ئەوەشدا لەسەرمانە جەخت لەوە بکەینەوە کە هەموو ئەوانە غەریب بوون کاتێك هایدگەر هەوڵی دەدا بۆ روون کردنەوە لە رێگای ئاراستەیەك کەئاسۆو ڕووناهیەکان جێگیر بکات ،زیاتر لەوەی بگەینە خاڵێکی دیاریکراوو بەرووەختە نەخشە بۆ کێشراو .



لێرەوە با هەندێ دراوی تایبەت لەم بارەیەوە بخەینەڕوو.. بە دڵنیاییەوە (زینون ) زەمەن و فەزا دەخاتە ڕوو، بەلاّم بە تێگەیشتنی هەڵە ،تێگەیشتنی دابڕکار ، کە هەرگیز ڕێگا بە خستنە ڕووی شتەکان،یان بە ئاشکراکردن و روونکردنەوەیان نادات ،لەبەر ئەوە ..فیکر لەگەڵ زینۆندا دەگۆڕێت تاوەکو نزیك لەو پایەی کە هەر یەکە لە هیرۆکلیتس و بارمینیدس "(١) پێی گەیشتن . سۆفستاییەکانیش بە مەسەلەی زمانەوە گیرسانەوە ،کە ئەو بابەتە، لە پەیوەندیەکی گەرمدایە لەگەڵ مەسەلەی وجود .بەلاّم ئەوان مەسەلەکەیان بەبەکارهێنانی ڕستەوچەمگەلێك و بە زیاتر جەختکردنەوە سەر کارو کرداری زمان و ، هەروەك بە زیاتر جەخت کردنە سەر لادان و پەنا تاریکەکانی ،چارەسەر کرد.

لەو کۆمەڵە نوسراو و دانراوانەی کە گەیشتوونەتە دەستمان .. پێویستە لە نێویاندا ناوە باشەکان دیاری بکەین.. بە ڕێکەوتیش نەبوو کە هایدیگەر زیاتر لە جارێك لە نموونەکانی خۆیدا ، هەردوو گفتوگۆ ئافلاّتوونیەکەی کە دەربارەی کۆمەڵێك نەریتی سۆفستایین ،دیاری بکات .

ئێستا هیچ شتێکیان نەماوە ،تەنها ئەوانە نەبێت کەبە پۆست ئافلاّتوونی ناویان دەبەین ،بەلاّم ئاخۆ زۆر درەنگتر لە هایدگەر نەهاتوون؟ ئایا ناکرێ میتافیزیکیا

بەهۆی ئەو هەوڵەی کە سۆفستاییەکان دەربارەی لۆژیكو مۆڕاڵ دایان ، بشاردرێتەوە ؟ زانستی ئاکار بۆیەکەمجار، هاو شانی لۆژیك و فیزیك لە قوتابخانەی ئافلاتون دەردەکەوێت ،ئەو پسپۆڕیانەی لەو ماوەیەشدا دەرکەوتن، تیایدا بۆ فەلسەفە گۆڕا.

کەواتە دەبێ گفتوگۆ لەتەك هێرکلیتس و ئەنکسیمندریس و ئافلاتون( لە ڕێگەی ئەویش لەگەڵ سوکرات و ئەرستۆتالیس) بکرێت .

بەڵام بۆچی بەردەوام گریك لە فیکری هایدگەردا بوونو ئامادەگی بەردەوامی هەیە ؟ بۆچی ئەو کۆکردنەوەیە: گریك ئەو شتەی کە زیاتر پێ دەچێ بمانگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمێك زیاتر لەوەی بۆ نەریتمان بگەڕێنێتەوە؟ ئایا ئەمەیان جۆرێکە لە سۆزی گەڕانەوە بۆ جیهانێك کە لەوانەیە پێویست بکات، لەبەر چاو بگیردرێت و دابهێنرێو سەر لە نوێ بژێنرێتەوە ؟ یان هایدگەر شتێك نییە جگە لە مێژوونوسێکی فەلسەفە،ئەوەی لە بنەڕەتیشدا لای گرنگە بە جدیەت و توانایەکی سامناك: جدیەت و توانایەکی باوەڕ پێکراو ،فیکری (ڕاستەقینە)مان بۆ بگەڕێنێتەوە ، ئەوەش لە میانەی ڕوانینی سەردەمی خۆی ؟"کاتێك دەڵێین گریك " هایدگەر دەنووسێ "بیر لە سەرەتای فەلسەفە دەکەینەوە" . گریك بەو مانایە دەنگێکی جیاوازی هەیە لە بەرامبەر دەنگی (لاتینی )و(ئەڵمانی)و (یابان)یەکان.



گریك بەو مانایە ئەو ئیمتیازەشە کە فەیلەسوفێك لەسەر حیسابی ئەویتر دەریخات یان بیخاتە ڕوو، بۆ نموونە ئیمتیازێك ببەخشێت بە(بارمینیدس )لە سەر حیسابی (هێرکلیتس ) یان بۆ (ئەرستۆتاڵیس) لەسەر حیسابی (ئافلاتوون ) . گریك وتەیەکە هاوکات ڕووبەڕوو بوونەوەی پێویست لەگەڵ (هێرکلیتس)و (بارمینیدس) دەگەیەنێ ، وەك ئەوەی هایدگەر لەسەر ئەوە سوور بێت کە ئاماژە بەوە بدات مەحاڵە لەبارەی ئەوە بنووسین و بدوێین بە بێ نووسین و باسکردن لەویتر .

ئەو وتەیەی پێشووتر قەرەبووی ئەوە دەکاتەوە کە پێدەچێ هەریەکە لە (هێرۆکلیتس)و (بارمینیدس) وەك ئەوەی هاوڕێ بن لە ململانێیەکدا ڕووبەڕووی یەك دەبنەوەو دەرەنجامەکەی سەرکەوتوو،دۆڕاوە ، یاخود وەك ئەوەی هەردووکیان داهێنەری نەریتێکی فەلسەفی دژیەك بن ، ئەوانە لە فیکری هایدگەردا وەك دوو فەیلەسوف دەخرێنە ڕوو کە زەمینەیان بۆ دەرکەوتن و کرانەوەی وجودی فەلسەفی خۆشکرد، بەم شێوەیە ڕووبەڕووبونەوەی هایدگەر لەگەڵ گریك دەبێتە گەڕان بەدوای بنەماکانی فەلسەفە نەك شتێکی جیا لەوە .

کاتێك هەریەك لە ئیریك روبارسی و دۆمینیك لۆبۆهان و جۆن بۆڤری ، پسپۆڕ لە فەلسەفەی هایدگەر پرسیاریان کرد کە" بۆچی ئەم هەموو گەڕانەوە





بەردەوامە بۆ گریك لە فیكری هایدگەردا ؟ " ، وەڵامی دایەوە "چونكە گریكەكان بە بێ هیچ لەبارەوە زانینی ئەوان (ئەندازیار)ی پێشەنگی وجود بوون "(٢) . لێرەوە پێدەچێ ئەوە ڕوون بێت كە ئاڕاستەی هایدگەر ، ئاڕاستەیەكی مێژووبەندی فەلسەفی نەبووە كە گرنگی دابێت بە سەر لەنوێ نۆژەن كردنەوەی سیستەمی فەلسەفی كۆن ، بەڵكو ئاڕاستەیەكی فیكری جێگیر بوو لە سەر بنەمای لێكۆڵینەوەی میتافیزیك . لەو حاڵەتەشدا ئەوە گرنگ نیيە ، تەنها ئەوە نەبێت كە ئەمڕۆ چی لە پەرستگای ئێفیسۆس (EPHESUS)ماوە ، كەوا هێركلیتس تەنها عاشقی كۆڵەگەو بنەماكانی دروست كردنی ببوو . بە پشت بەستن بەمەوە دەتوانین بڵێین ئۆیگین فینك لەسەرهەق بووە كاتێك ئەمەی لە دەستپێكی زنجیرە لێكۆڵینەوەكەی تایبەت بە هێركلیتسی ڕاگەیاند. لە میانەی گفتوگۆی مارتن هایدگەر لەگەڵ گریك لە زۆربەی بەرهەمەكانیدا ، ئێمە لە تواناماندا هەیە ئەوە فێر ببین كە چۆن سەختترین دووری دەبێتە نزیك و زیاترین ناسین دەبێتە نامۆیی ، هەر وەك ئەوەش فێر بین كە چۆن بەلای ئێمەوە سەختە بگەینە كۆتایی .

تێڕامان و ڕاڤەكردنێك كە گریكەكان جەختیان لێكردۆتەوەو پشووی بۆ بدەین . گریك بە لای ئێمەوە پێ دەچێ فراوان و ترسێنەر بێت ". فەیلەسوفانی



دیكەش هەوڵیان داو ، هەریەكەی لە سەردەمی خۆی ، كە ڕووبەڕووی ئەو خۆسەپاندنە ببنەوە ، بۆ نموونە نیتچەو هیگل. كە دەچنەوە سەر جیهانی هایدگەر ، وەلێ ئەو دوو فەیلەسووفە ئێمەیان گەیاندە كۆتایی فەلسەفە نەك سەرەتای فەلسەفە ، وەك ئەوەی هایدگەر كردی . "هیگل و گریك" ، "نیتچەو گریك " ئەمە وێكچووێكەو لە هەمان كاتدا جیاوازیشە لەو گووتەیەمان كە"كانت و گریك" یان " لایبنس و گریك " ە ، بۆچی؟. " هیگل وای بیر لە فەلسەفەی گریك (یۆنانی) كردەوە كە یەكەیەكی تەواوكراوە ". ئاخۆ هایدگەرو نیتچە ئەو هەوڵەیان نەداوە ، بە تەواوی هەروەك هیگل هەوڵی دا بە شێوەیەكی دیاریكراو فەلسەفە ببەزێنێ؟

ئەو جۆرە پرسیارە بە بەردەوامی لەو بازنە فەلسەفیەدا دووبارە دەبێتەوە . هەموو جارەكانیش دەكەوینە بەر شوك و توندیەكەی .

"بۆیە گەڕانەوە بۆ گریك هیچ مانایەكی نیيە تەنها ئەگەر بەزاندنی فەلسەفەی گریك نەبێت ، هەروەك لێرەدا بەزاندن بەو مانایە نیيە . كە فەلسەفەیەك دەبینین ڕەسەنتر لە فەلسەفەی گریك ، بەڵكو هەوڵبدەین بچینە ناوو بگەینە جەوهەری فیكرەكەیان.









کارل یاسبرس

# هایدگەر و شیعر

میشێل هار

جوانی‌و لەسەرخۆیی‌و هێزی خوێندنەوەی یەك بەدوای یەك‌و فراوانی بۆ هۆڵدەرلین‌و ریکلەو تراکل، هەموو ئەمانە وامان لێدەکەن کە هەندێ جار ئەوە لای هایدگەر (Heidegger) لەبیر بکەین کە دەستپێشخەری سەرەتاکانی فیکرەیەکی نوێ‌و لەرەگەوە بوو بێت بۆ (شیعر) وەك خۆی " جەوهەری شیعر" (١) ناکرێ بەتەنها تێیبگەین، یان وەك پشتیوانیەکی سەرەتاییانەی ئەنتۆلۆژی بۆ جۆرێکی دیاریکراوی ئەدەب سەیری بکەین، بەڵکو دەسپێك تێکهەڵکێش بوون‌و گونجانی لەگەڵ سێ مەیدانی بەیەکەوە گرێ دراوە. کە ئەمانەش:" کاری هونەری‌و زمان‌و موقەدەس Dashilige "ن. قەسیدە کاری هونەرییە" ماددە"کەی

یان بەمانایەکی دیکە رەگەزەکەی (ئەمەیان لەسەرمانە کە جارێکی دیکە چاو بەچەمکی وشەی ماددەدا بخشێنینەوە" زمانە کە موقەدەس بالآدەکات. لەکاتێکیشدا کە پرسیار سەرهەڵبدات. هایدگەر چۆن ئەوە رەتدەکاتەوە، هەروەك كردی، لەسەر قەسیدەی گەڕانەوە بەرەو خودێتی شاعیر، یان بۆ ئەزموونی زیندوو، یان بۆ مێژووی کەسینی خۆی؟ زمان چۆن دەتوانێ قسەبکات ، یەکەمجار قسە لەسەر خۆی بکات"بەر" لەشاعیر؟

چۆن ئەوە جێگیر بکەین کە لەبنەڕەتدا شیعر شتێکی موقەدەس دەڵێت، شتێکی موقەدەس کە دەکرێ سەربەخۆو جیاواز بێت لەئایینو کۆنتر لەهەموو ئاینێك، وەك ئەوەی تێیدەگات نەك وەك فەزایەکی بێ خەوش، بەڵکو بەمانایەکی دیکە وەك هێزێکی پۆزەتیڤو ئارام بەخشو فریادرەس؟ ئەو پاکێتیە چییە لەرێگای شیعرەوە؟ئایا ئەمە جگە لەهەموو ئەو شتانە هەڵاتنێکی رۆمانتیکیانە نییە بۆ دەرەوەی ژاوەژاوەکانی ئەم دونیایە؟ ئەو شتە چییە کە کاری هونەری لە (ئامێر) جیا دەکاتەوە؟ ئەو شتە چییە کە قەسیدە لەریکلامێك جیادەکاتەوە؟ ئەوەیە کە کاری هونەری لەپێناو ئەرکێك یان لەپێناو کارێکی بەرژەوەندییانەو ماددیانە ئەو ماهیەتەی لێی دروستکراوە نابەزێنێ. کاری هونەری خوڵقاندنو هەڵقولانە لەسەرچاوە رەسەنەکان، چونکە



ئەمانە لە بەکاربردنی ئامێریانەی شتەکانەوە کە شاراوەو ونن، سەرهەڵدەدەن! سۆز، پێکهاتە ، راڕایی، یان هەر شتێك کە لەدونیای میتافیزیکیادا بەهەستۆکەکان ناوبەرێت. کاری هونەری لەرێگای گوزارشتەوە ئاگایمان رادەکێشێ،بۆ قولآیی هەستۆکەکان کە بەهۆی ئەو بەرژەوەندییەی لەپێناویدا بەکاردێت لەبیرکراون.

هایدگەر هەوڵدەدات دەربارەی ئەو قولآییە هەستۆکیەو لەرێگای چەمکیی "زەوی" بیربکاتەوە:" ئەوەی کاری هونەری دەیەوێو ئەوەشی لەرێگای کشانەوەی دەریدەخات ناومان ناوە زەوی" ئەو بەردەکانو دارەکانو کانزاکانو رەنگەکانو دەنگەکان" والێدەکات رۆح بدەنو پڕ بن لە جوڵە.

کاری شیعریش بەشێوەیەکی تایبەت سەدای زمان روندەکاتەوە، هەروەك" تواناو هێزی ناونان لە وشەدا" دەخاتەروو.

ئەو کاتێك ئەو هێزە رەسەنەی ناونان بەدەردەخات، ئەو هێزەی کە لەبنەرەتەوە بۆ شاعیر نا، بەڵکو بۆ زمان دەگەڕێتەوە کەچی شیعر ئەوە بەدەردەخات کە لەزمانی سادەدا ونە، یان ئەو زمانەی کە خەڵك تەنها وەك کەرەسەیەکی گفتوگۆ بەکاریدێنن. هەموو شیعرێك جەوهەری خۆی دەڵێت، لەهەمان کاتدا جەوهەر رونکەرەوەیە بۆ ئەو زمانەی کە " قەسیدەی رەسەن"ە، کە خۆمەڵاسدانی بێدەنگانەی کائینە. قەسیدە تواناو





هێزی خۆی نیشان دەدات لەئاست بەدەرخستنی شتەکانو ئاشکراکردنی دونیا، لەو ساتەدایە ئەو ، ئەوشتە دەکات. ئەوەشەبارستایی زەوی‌و توانای دامەزرانیان پێدەدات. هایدگەر لەمەڕ شیعر دەڵێت، " زمانی ڕەسەن-Ursprache "ی خەڵکە، ئەو زمانەیە کە ئەو" کەڵەکەبوونو فرەبوونە سەرەتاییە" دەگێڕێتەوە کە زمانی لێپێك هاتووەو لەبێدەنگیدا گەیاندوویەتیە کرانەوە." شیعر ناونانی دامەزراندنە بۆ هەر کائینێكو بۆ جەوهەری هەموو شتێك- قسەیەکی دەمارگیرانە نییە، بەڵکو ئەو زمانەیە کە بەهۆیەوە هەموو ئەو شتانەی دواجار دەمانەوێت چارەسەریان بکەینو گفتوگۆیان لەسەربکەین، دەیاندۆزینەوە.هەرشیعریشە وادەکات زمان شتێکی مومکین بێت".

لێرەوە ئەو لێك جیابوونەوەیەی کە لەنیوەی ڕێگادا شیعر دەخاتە نێوان کرانەوەی ڕەسەنو زمانی ڕۆژانە: Urdichtung، کە (قەسیدەی نوسراوە) Alltagsspracheکە (زمانی سادەیە). دەبێت لێرەشەوە تێبینی ئەوە بکەین کە زمانی ڕاگەیاندنو زانستی ئاراستەکردنیشی لەزمانی سادە جیابۆتەوە ، کەوا بەهەدەرچوونێکی دووقات بەنیسبەت شیعرو زمانی ڕۆژانە لەخۆدەگرێ.

شیعر دەست لەسەرزەمینی زمان دەدات، زمانیش وا دەردەکەوێت کە زەمینە یان بنچینەیەکە قەسیدەش هەموو ئەو شتانەی کە زمان بەکراوەیی جێیان دەهێڵێت، دەیانکاتە ڕێگاپێدراوو بینراو.. هایدگەر جەخت لەخۆی دەکاتەوە بۆ لابردنی دیاردە" هەستۆکیەکان"ی زمان، مەبەست لەڕێگا پێدراوو بینراوەکان لەمیتافیزیکیای هەستۆکی‌و لەفینۆمینۆلۆژیا(دیاردەناسی)ە.

کاتێکیش وتەی شیعری زمان، توانای بەسەرکرانەوەدا بەرەندە دەبێت، بەشێوەیەکی هەستپێکراوو ڕێگاپێدراوانە، ئەوا تەنها دەنگەکانو نیشانەو ئاماژەکان بەدەرناخات، بەڵکو ڕەهەندی بنەڕەتی جێگیربوونی مرۆڤ بەدەردەخات: وشە بەمانای هەستۆکیەکەی فراوانی فەزای یارییەکانی نێوان زەمینو ئاسمان دەپێوێت. زمانیش ئەو مەیدانە بەکراوەیی دەهێڵێتەوە کە تیایدا ئەو مرۆڤەی لەسەر زەمینو لەسایەی ئاسماندا، لەماڵی دونیا نیشتە نییە". دەنگدانەوەی" ماددیانە"ی دەنگی شیعری جۆری ئەو پەیوەندییە بەدەردەخات کە زەمینو جیهان بەیەکەوە گرێ دەدات. هەروەك ئەو پەیوەندییەش شوێنی نیشتە نییە، لەزمانی سادەدا کە تەنها خۆی لەسەرقاڵی بەئامانجە پراکتیکیەکانو پێ ڕاگەیاندن دەبینێتەوە، هەروەك دەتەپێتو لەبیردەچێتەوە.

کاتێکیش بۆ خودی خۆی دەگەڕێتەوە،مەبەست لە گەڕانەوەیەتی بۆ تایبەتمەندێتیە تەپیوو شارەوەکانی، ئەوا زمان بۆ دەسەڵاتە ڕەسەنەکەی دەگەڕێتەوە، کە دەسەلاتی ناونانو بەڵگەهێنانەوەیە. کە ناو لەشتەکان دەنێین کەواتە وادەکەین شتەکان هەبن. وشەیە توانای " لەدایکبوونی شتەکانی" هەیە؟ئەو توانایە بەتەواوەتی لەلایەن زمانی کەلوپەلی"ئامێری" لەبیرچۆتەوە. ئەگەر شیعریش شتەکان بەدەربخات، وەك ئەوە وایە کەسەرلەنوێ لەدەرکەوتنو لەدایکبووندا بێت، وەك ئەوەی " کە یەکەم جاربێت بیبینین" ئەوەشیان ئەوە ناگەیەنێ کە " دەسپێشخەری بۆ وشەکان جێبێلین" (مالارمێ) ، بەڵکو بەدیوێکی دیکەدا سەرلەنوێ تواناو هێزی ئاشکراکردنی تێدایە. ئەو توانایەش لەخەیاڵی شاعیردا نییە. بەڵکو بۆ ئەو ئاشکراکردنە دەگەڕێتەوە کە زمان پێشتر لەبێدەنگیدا بەدەستی هێناوە. شاعیریش وەك هەموو بوونەوەرەکانی دیکە بەوە وازدەهێنێ کە دوای ئەمە، ئەوە بڵێت کە زمان بەدەنگێکی خەفەکراو دەیڵێت. لەسەر ئەو بنەمایە دەکرێت گرنگیدانە کەمەکەی هایدگەر کە بەخودێتی شاعیر دەدات وا ڕاڤەبکرێت: ئەمەیە کە حەقیقەتی زەمینو حەقیقەتی دونیا لەجیاتی ئەزموونی ژیانگەریی باڵا دەکات.

لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێ بڵێین شیعر تەنها لەمۆسیقای زمانو توانا ڕەسەنەکەی لەئاشکراکردنندا تەواو نابێت،



بەڵکو لەوێنەشدا بەرجەستە دەبێت . لەبارەی ئەم خاڵەو چەندین خاڵی دیکەش، ڕاڤەکردنی هایدگەریانە بەرەو ڕماندنی تیۆرییە میتافزیکیە کلاسیکیەکان دەڕوات.

وێنەی شیعری کۆپیێکی دارماوی واقیع نییە، هەروەك پەیوەندییەکی مەجازی یان نێوبەندی نێوان هەستۆکیو ماقول نییە، هەروەك تایبەتمەندییەکی ئەزمونگەری بۆ ڕەسمی خەیاڵ نییە کە خودێتیەکی لەخۆبایانە بەرهەمی هێنابێ، نزیکبوونەوەیەکی بەزێنەری واقیعیش نییە. بەبەدوورخستنەوەی ڕەهەندەکانی لەواقیعی عەقڵو کەماڵدا. هایدگەر لە ئەفلاتونو کانت زیاتر واقیعیانەبوو، بەڵکو لەئەرستۆش، هەروەك هایدگەر دژکاربوو لەگەڵ بیرۆکەی نیتچە کەوا مالارمێ تەواوی کردو دواتر سوریالیەکانیش پشتیان پێبەست کە دەڵێ شیعر بەتەواوی بەشێکە لەخەیاڵ هایدگەر دەڵێت :" جەوهەری وێنە" ئەوەیە" کەوامانلێبکات شتێك ببینین". وێنەی شیعری ژیانی ڕۆژانەمان نیشاندەدات، وەلێ بەشێوەیەکی نامۆ نیشانمان دەدات. بەشێوەیەکی " نابینراوانە نیشانمان" دەدات، یان غوربەتیانە، لوغزی ئامادەگی لەنێو ڕاستی بینراودا زۆر سادەو زۆریش ڕوونە. بەدیوێکی دیکەدا لەوێنەی ناسراودا دەرەنجامی جیهانی ساکار دەشارێتەوە ، ئەمەش گرانتیکی نابینراوی غەریبە لەشێوەی ناسراودا بەڵام غەریب چییە؟ تەنها ئەو شتە سەرسورهێنەرو سەرقاڵکەرەی فیکر نییە. بەڵکو بەتەواوی شتێکی ترە ،





ئەویش کشانەوەی بوونەوەرو موقەدەسە، کە (خودایە). وێنەیەکە ڕاڤەناکرێ ، بەڵکو ڕووبەڕووی ناکاوی غوربەت دەبێتەوە. (خودا ) وەك هۆڵدەرلین دەڵێت:"ڕوونە وەکو ئاسمان" ئاسمان وێنەی خودایە، نەك وێنەی وێکچونی ئەو. وەلێ ئەگەر لێرەو خودا لەلایەن شاعیرەوە ناوبنرێ، ئەوا بەنیسبەت هایدگەر ئەو مانایە ناگەیەنێ کە موقەدەس دەگۆڕێت بۆ ناوێکی تاك‌و تەنها یان لەدارشتنێکی سادەدا چڕ دەبێتەوە. نابینراوو ونکراویش ئەوا شاعیر لەرێگای دیاردەی بینراو بەدەریدەخات، ئەوەی کە ونکراوە، دەبێە"نادیار". بابەتی شیعریی ورد نییە لەوەسفکردندا، بەڵکو چەندین ناو لەخۆ دەگرێ، کە هەندێ جار دژکاری یەکترن لەگەڵ ئەوەشدا هاوئاستن: دێرین کە لەپێشانداو لەئایندەی نزیکیش ، نزیك بوونەوە لێی ئاسان نەبووە، سادەو ناسادە، تێری‌و برسێتی، ئارامی‌و سامناکی، " موقەدەس‌و ترسێنەری خودێیەتی" هیچ شتێك لەئارادا نییە نە شیعرو نەفیکریش تەنها لەرێگای تارانی بنەڕەتی نەبێت‌و لەرێگای (هەژاری)یش هیچ شتێك نییە جگە لە توندی‌و زەرورەت. شاعیر پرسیار لە موقەدەس دەکات، ئەو دەیەوێت، زیاتر لەوەی کە تیایدایە سەقامگیر بێت یان پەنای بۆ بباتو خۆی تیا حەشار بدات.. .. شاعیر بە پاکیەکەوە نایەت ئەو تەواوی نەبوونی خۆی دەپارێزێ، ئەو سەردەمی خۆی توشی هەژاری کرد نەك ژیانی تایبەتی خۆی. هەڵچوونەکەی سەرکەوتوو بوو، هەڵاتن نەبوو، ئەمەیان خەمزەدەیی‌و مەنفاکانی یاخیبوون‌و چەرمەسەری یان خۆشنوودیە بەمانای قوڵی وشە، هەموو ئەو هەستانە دادەرژێنە قوڵایی سەردەمەکەی‌و لەسەرچاوەکانی ئیلهام وەردەگرن، ئەمەش ڕۆیشتنێکی نوێی مێژووە.



فریدریك هۆڵدەرلین



# پاشای نهێنی فەلسەفە

هانا ئارندت

لە هەمان ئەو کاتەی هایدگەر ئاهەنگی لەدایك بوونی هەشتا ساڵەی خۆی دەگێڕا ، ئاهەنگی پەنجاساڵ تێپەرینیشی بەسەر بەدەستهێنانی پیشەی مامۆستای فەلسەفەدا گێڕا . ئەفلاتوون ئەو رۆژە وتی : " لەبەر ئەوەی سەرەتاش بۆی هەیە هەموو شتێك رزگار بكات بە ئاستی پەرشبوونی لە نێو خەڵکدا " . با گوێگر ، گوێم لێبگرێ کە لە سەرەتاوە دەست پێ بکەم. مەبەستم لەو سەرەتایە ساڵی لە دایك بوونی نییە کە(١٨٨٩) لە (ماسكيرچ ) (Messkirch ) بەڵکو ساڵی (١٩١٩) یە ، یان ئەو ساڵەی کە وەك مامۆستای فەلسەفە لە " فرایبۆرگ " دامەزرێنراو بەمەش هاتە نێو ژیانی ئەکادیمیانەی ئەڵمانیا .. لە کاتێکدا شۆرەتی هایدگەر

کۆنتر بوو له کتێبه به ناوبانگەکەی " وجودو زەمەن " "sein und zeit" که له ساڵی ١٩٢٧ دا دەرچوو . بەڵکو له تواناماندا هەیه پرسیار لەو سەرکەوتنه سەر سوڕهێنەرەی کتێبەکه بکەین ، نەك ئەو تێڕوانینەی که له سەرەتای دەرچوونی هەبوو ، به دیوێکی دیکەدا ئەو کاریگەرییە باڵایەی که ماوەیەکی دوور هەیبوو ، کەمێك له دانراوەکانی ئەو سەدەیه نەبێت پێی نەگەیشتن . نەدەکرا مومکین بێت ئەگەر ئەو سەرکەوتنه پێشوەختییە ئەکادیمییە نەبووایە ، کەوا ئەو کتێبه ئەوەی له گوێ ئەوخوێندکارانەی ئەو کاتە دوویات کردەوە. شتێکی سەیر له سەردەمی سەرکەوتنی یەکەم دا ڕوویدا ، لەوانەیه زیاتر بێت له رووداوی شۆڕەتی کافکا له بیستەکاندا ، یان شوهرەتی براك و پێکاسۆ له ماوەی دواتردا ، ئەمانەش مەبەست له ( کافکاو براك و پێکاسۆ ) یه ، لەلایەن خەڵکەوە ونبوون به مانا سادەکەی وشه ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاریگەریان بێوێنه بوو ، بەڵام به نیسبەت هایدگەر هیچ شتێك نەبوو ئەو شۆرەته پشتی پێببەستێ ، هیچ دانەرێکیش.. نا ،جگە له چەند تێبینیەکی نێو خوێندکارەکان نەبێت له کاتی وانه گوتنەوەدا . ئەو وانانه دەقه ناسراوە جیهانییەکانی شرۆڤە کرد ، له هیچ تیۆرێکی تایبەتیش پێك نەدەهات .. جگە له ناوێك هیچی تر نەبوو ، ئەو ناوەی که به تەواوی ئەڵمانیادا سەفەری دەکرد ،



هەروەك پاشای نهێنی ئاگاداری کردینەوە ، ئەمە هەرگیز به مانای ئەو " بازنانه " نەبوو ، که پێویستی به " مامۆستا " بووبێت ، بۆ ئەوەی پێشەنگی بکات و ئاراستەی بکات " وەك بازنەی "کیورگە George" بۆ نموونه . ئەو جۆرە بازنانه له لایەن خەڵکەوە بەباش ناسرابوون ، کەوای لەوەی دوای دەکرد له پشتی هالەیەك له نامۆیی ونبێت  که هاوەڵانی بازنەکه به تەنها پێیان دەزانی ، ئەوەی پەیوەندیشی  به هایدگەرەوە هەیە، هیچ نامۆیەك و هیچ موریدێك له گۆڕێ نەبوو . ئەوانەی که هەواڵەکەیان پێدەگەیشت بەبێ گومان یەکتریان دەناسی چونکه هەموویان خوێندکار بوون .. هەندێکیان بوونه هاوڕێ . دواجار لێرەو لەوێ گروهی به هەڵەپە دروست بوون، لەسەر بنەمای ئەوەی له وانەکانی هایدگەردا، بەڵام به هیچ شێوەیەك لەسەر بنەمای ئەو بازنەی گفتوگۆو وانانه دانەمەزران . هەروەك هیچ شتێکی نێوخۆ یان نهێنی نەبوو له بارەی ئەوەی کێن ئەوانەی هەواڵەکەیان پێ دەگات یان چی دەڵێن؟

لەو ماوەیەدا ، له کاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا ، نەك هەست کردن به یاخی بوون بەڵکو وەڕەسیەکی توند باڵی بەسەر زانکۆکانی ئەڵمانیادا کێشابوو . ئەو هەسته باڵی بەسەر هەموو دام و دەزگا زانستییەکان بەبێ جیاوازی کێشا ، هەروەك به سەر هەموو خوێندکاراندا به جیاوازی ئاستەکانیان دواجار بەسەر

دەزگای زانستی . بە مانایەکی دیکە پسپۆڕی ئەوانە بوو، کە دەیانزانی تووشی ماندووبوونێکی زۆر دەبنەوە لە ژیانیاندا ، ڕێگاکانی گوتنەوەی فەلسەفە تا بڵێی دواکەوتووبوو ، بە شێوەیەك کە لە ئاستی ئەو پێویستیەدا نەبوو بۆ ئەوەی دەیەوێت هەست بە شت و جیهانی دەوروبەری بکات . وانە فەلسەفیەکان دەربارەی مەعریفەو ستاتیکاو لۆژیك تا ئەوپەڕی پەرش و بلاْوو لەبار یەکچووبوون. بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەوبارە تراژیدیەش ، بەر لە هایدگەر چەند یاخیبووێك دەرکەوتن ، بە پێی زنجیرەی مێژوویان دەتوانین کە ناوی (هۆسێرل Husserl)) و بانگەوازەکەی بۆ چوونە (سەر خودی شتەکان ) بهێنین ئەمەیان بەو مانایە بوو کە: " با لایەنی تیۆری و کتێب جێبهێڵین " و فەلسەفە بەو شێوەیە وەرگرین کە زانستێکی وردەو شوێنگەی خۆی هەیە لە پاڵ زانستە ئەکادیمیەکانی دیکە .. ئەو شێوە قسەکردنەش زۆر سادە بوو ، هەروەك بەدەربوو لە هەر بانگەشەیەك بۆ یاخیبوون ، بەلاْم بە هەر حاڵ ئەو شتە بووکە (شیلار scheler) و دواتریش هایدگەر پشتی پێبەست . لە دوای ئەمەو لە " هێدلبارگ " یەکێك لە یاخیبووە کردەییەکان دەرکەوت کە ( کارڵ یاسپرس Karljaspers) بوو ،کە پەیوەندیەکی دۆستانە بە هایدگەری دەبەستەوەو، بۆ ماوەیەکی درێژ ئەو پەیوەندییە بەردەوام بوو . هۆیەکەشی ئەوە بوو

پرۆژەی هایدگەر ئەو " یاخیبوونە" ی تێدا بوو کە(یاسپرس ) شتێکی فەلسەفیانەی رادیکالاْنەی تێدا بەدی دەکرد ، لەنێو ئەو زێدە رۆییە ئەکادیمیەی دەربارەی فەلسەفە هەبوون . ئەو شتەی خاڵی کۆکردنەوەی نێوان ئەو ژمارە کەمەی فەیلەسوفەکان بوو. با لێرەدا وشەکانی هایدگەر بەکار ببەین - ئەوە بوو کە توانیبوویان جیاوازی " لە نێوان ئەو شتەی مەعریفە بە وردی دەیەوێتو ئەو شتەی بیری لێ دەکەینەوە " بکەن. ئەوان گرنگیان بە شتی دووەمدا مەبەست ( لەو شتە کەبیری لێ دەکەینەوە ) ، بەلاْم گرنگیان بە شتی دووەم نەدا. وردە وردە هەواڵی لە " فرایبۆرگ " ەوە دەگەیشت، کە دەڵێت پیاوێك هەیە بە تەواوی گەیشتۆتە ئەو شتانەی کە " هۆسێرل" دەربارەیان دوا ، ئەو دەزانێت کە ئەمە لە ئەرکی ئەکادیمیدا نییە ، بەڵکو ئەرکی کەسێکە کە بیر بکاتەوە. ئەم مەسەلەیە حەقیقەتی لە دایك بووی دوێنێ یان ئەمرۆ نییە. بەڵکو هەر لە سەرەتاوە لە ئارادایە. هەروەك ئەو پیاوە ئەوە دوبارە دەکاتەوە کە لە توانایدا هەیە سەر لە نوێ رابردوو ئاشکرا بکات ، ئەگەر چی پردی نهێنی لەگەڵ کلاسیکی کۆندا بە نیسبەت ئەوەوە بە تەواوی پچڕاوە. ئەو دەڵێت لە جیاتی ئەوەی کە قسە لە سەر ئەفلاْتون بکەین و تیۆرو بیرۆکەکانی بخەینەروو، دەبێ ساڵێکی خوێندنی تەواو هەڵسین بە

گفتوگۆکردنێك كه هەنگاو هەنگاو بەردەوام بێت، تاوەكو بە تەواوی ئەو تیۆرە ون دەبێت كە هەزار ساڵە هەیە، هیچ شتێك نامێنێت تەنها ئیشكالیەتی ئێستا نەبێت بە گەورەیی و باڵایی خۆی . ئەو جۆرە مەسەلەیە ئەمڕۆ بۆ ئێمە مەسەلەیەكی ساكارو ناسراوە. زۆرێك لە خەڵك ئەمڕۆ لەسەر ئەو میتۆدە دەڕۆن. بەڵام پێش هایدگەر ، هیچ كە سێك نەبووە . هەواڵەكە بە سادەییەكی زۆرەوە ئەوەش دەڵێت: فیكر، زیندوێتی خۆی گێڕاوەتەوە .. قسە لە سەر ئەو خەزێنە رۆشنبیریانەی رابردوو دەكات، كە ئێمە پێمان وابوو مردن و لە ناو چوون . ئەوەتا لەسەر زبانی ئەو پیاوە دێتەوە بۆ ئەوەی پێشنیاری شتی نوێتر بكات، شتێك تەواو جیاواز لەوەی ئێمە وێنامان كرد ، لەوانە هەڵوەستەمان دەكردوو بە ئاگا بووین لەوەی لێرە مامۆستایەك هەیە .. ڕێپێدراوە كە فێر بین چۆن بیر بكەینەوە. كەواتە پاشای نهێنی لە مەملەكەتی فیكر كەوا لەو جیهانەدایە، لەگەڵ ئەوەش كە تیایدا شاراوەیە تا ئەو رادەیەی ئێمە ناتوانین جەخت لە سەر بوون یان نەبوونی بكەینەوە، جگە لەوەی دانیشتوانی زیاتر لەوەی كە ئێمە وێنای دەكەین . ئەگەرنا چۆن دەتوانین ئەو كاریگەرییە نایابەی و هەندێ جار وشكەی فیكری هایدگەر یان شرۆڤە كردنەكانی بۆ دەقە فەلسەفیەكان راڤە بكەین، كەوا بە بەزاندنێكی گەورە ، بازنەی قوتابیەكانی دەبەزێنێ ، ئەوەی جێی مەبەستی



ئێمەیە بە گشتی بە فەلسەفەوە پەیوەستە . لە رای مندا فەلسەفەی هایدگەر نییە ، - هەقی ئەوەشمان هەیە وەك " جان بۆڤری " فەڕەنسایی ئەو پرسیارە بكەین كە بە هەق فەلسەفە هی هایدگەرە یان نا - بەڵام بیرۆكەكە ئەوەیە كە ئەو بە شێوەیەكی یەك لایكەرەوە لە دیاری كردنی نمای فیكری گشتی لە سەدەی بیستەمدا بەشداری كردووە . ئەو فیكرەش بە سیمای بەزاندن و تێپەڕاندن جیا دەكرێتەوە، كە سیمایەكی تایبەت بە خۆیەتی ، لەو سیمایە هیچ شتێكی دیكە پێناگات. هێزی ئەو سیمایەش خۆی لەكرداری " فیكر " ەكە دەبینێتەوە . هایدگەر بیر لە "لە" یان " دەربارە" ی شت ناكاتەوە ، بەڵكو " شت بەبیر دەخاتەوە " لەو چالاكیە دوورە لە هەموو شێوەیەك لە شێوەكانی تێڕامان لە قولاییەكاندا مەلە دەكات ، كەچی ئەمە بەو مانایە نییە كەوا مەلە دەكات بە ئامانجی دۆزینەوەی سەرزەمینە كۆتاییو ئارامەكان ، بەڵكو بۆ ئەوەی ڕێگای نوێ بكاتەوەو خۆیشی لە قولاییدا نیشتەجێیە ، چەند ئاماژەیەك ( Wegmarkn) دابنێت. ( ئەمە ناونیشانی كۆمەڵە وتارێكیتی كە لە نێوان ساڵانی ( ١٩٢٩- ١٩٦٢ ) دا نووسیویەتی ) . فیكر وەك ئەوەی هایدگەر دەبینێ ، دەتوانێ ئەركێك بۆ خۆی پێشنیاربكات و دەتوانێ " كێشەكانی" بۆ ڕاكێش بكات . بە هەر حاڵ هایدگەر خاوەنی شتێكی تایبەتە كە گرنگی پێ دەدات ... یان ئەو





به مانایەکی دیکە ، شتێك هەیە هانی دەداو سوری دەکات لە سەر کارکردن . کەچی ئێمە ناتوانین ئەوە بڵێین کەئەم جۆرە فیکرە ئامانجێکی هەیە، بەردەوام لە حاڵەتی کارکردندایە . هەتاوەکو ڕێگای گونجاو بێت بە مانایەکی دیکە کردنەوەی ڕەهەندی نوێ جگە لە بەدەستهێنانی ئامانجەکە ، بەر وەختەدیاریکراوە . دەبێ ڕێگاکان ئارام بن ( بۆ نموونە ڕێگای دارستانەکان Holzwege) ئەوەش ناونیشانی کۆمەڵێك دەقە لە نێوان سالآنی (١٩٣٦ - ١٩٤٦ ) دا نووسیویەتی . چونکە بەرەو ئامانجێکی دیاریکراوی دەرەوەی دارستانی نابات .. " لە ناکاوڕا دەیخاتە نێو بێهێزیەك و دواجار پێکانی خاو دەبنەوە " ئەمەزۆر جوانترە بە نیسبەت کەسێك کە دارستانی خۆش بوێت ، لەوکێشە نەخشەدارە وردو پڕ چاودێریانەی کەلێکۆڵینەوەی پسپۆڕانی بواری فەلسەفە و زانستە مرۆییەکان لە سەری ڕاهاتوون و کەوتوونەتە ناوی. هایدگەر لەو ڕەهەندو قولآییەی کە تەنها بەفیکری خۆی کردیەوە، رایەڵێکی گەورەی لە ڕێگاکانی ئەو فیکرە دامەزراند . بە هەر شێوەیەك بێت تاکە دەرەنجامی بەپەلە کە لەبەر چاو گیرابێت و قوتابخانەکەی دامەزراندبێت ، ئەوە بوو کە بووە هۆی ڕووخاندنی هەرەمی میتافیزیکای لە ئارا ، کەوا تاوەکو کاتێکی درێژ هەستی پێنەدەکرد کە ئارامگیرە . ئەوپرۆسە مێژوویەش کە لەوانەیە لە خانەی یەکەمەوە



بێت . ئەگەر چی لەسەرمانە زۆر گرنگی بەمە نەدەین ، چونکە ئێمە لە دەرەوەی هەموو پسپۆڕیەکین ، پسپۆڕی مێژووشی لەگەڵ بێت . ئەگەر " کانت " بە هەق و لە ئاسۆیەکی دیاریکراودا ناوی نابێت " روخێنەر " ئەوا من باوەڕم وایە ئەو سیمایە بەسەر رۆلە مێژوویەکەی جێبەجێ دەبێت ، نەك ئەوەی لەسەری بووە . بەڵام بە نیسبەت هایدگەرو ڕۆڵی لە ڕووخاندنی بونیادی میتافیزیکا کە بەهەر حاڵ لەسەر ڕوودان بوو ، لە توانامدا هەیە ئەوە دوپات بکەمەوە کە بە تەنها ئاماژە بەوە بدەین ، چونکە رووخاندنەکە بە شێوەیەکی گونجاوتر لە پێشوو ئەنجامدرا ، میتافیزیکا لە هەموو ڕەهەندو دەرەنجامەکانی شرۆڤە کرا یان لێکدرایەوە .. بە تەنهاش تێنەپەڕێنراو نەبەزێنرا لەلای کەسێك کە دوای ئەم هاتبێت. " کۆتایی فەلسەفە " هەروەك هایدگەر لە ( Zur Sachedes Denkens) دا دەڵێت ، کەوا کۆتاییەکە سەرپەرشتی ئەو فەلسەفەیە دەکات کەسێك ئامادەی کردووە زیاتر لەهەموو کەسێك پێیەوە پەیوەستە .. یان ئەوەی کە بە درێژایی ژیانی لەمیانەی وانەو دەرسەکانی باسی کرد ، دەقی فەیلەسوفەکان وەك لۆژیکێك بۆ کارەکانی ، هەرگیز پشتی بە دەقێك لەدەقەکانی نەبەست ، تەنها لە ماوەی پیربوونی نەبێت!





# هایدگەرو نازیەت

دەسپێك : ئایا مارتن هایدگەر کەوتە پاڵ بزوتنەوەی "سۆسیال ناسیۆنالیستەکان" و پشتیوانی لە سیاسەت و ڕوانینە فکریەکانیان کرد ؟ ئەو پرسیارە کە ئێستا زۆرێك لە بیرمەندو فەیلەسوفەکانی لە زۆربەی وولأتانی ئەوروپا سەر قاڵ کردووە ، بە تایبەت لە فەڕەنسا و ئەڵمانیا . هەر لە دەرکەوتنی کتێبی "هایدیگەرو نازییەت " ی نووسەری چیللی "ڤیکتۆر فاریاس " کە لە پاییزی ١٩٨٧ دەرچووە ئەو پرسیارە خرایە ڕوو ، کەنگەشەیەکی دوورو بە درێژی، دەربارە کرا.

ئەوەی نوێیە لەو کتێبەدا چیە ؟ ئایا بەڵگەو گەواهی قەناعەت هێنی دەربارەی ئەو دۆزە پێشکەش



ئوتێلی برید لە " ناگۆلد"

کردووە؟ کاریگەری ئەو جۆرە تۆمەتانە چییە لە سەر فەلسەفەی هایدگەر کەوا دادەنرێت قوڵترین و وردترین فەلسەفە بێت لەو سەردەمەماندا ؟ ژمارەیەك بیرمەندو فەیلەسوف لەمیانەی ئەو دۆسیەی کە لە لایەن ( فیکرو فەن)،دەربارەی ئەم مەسەلەیە ئامادە کراوە ، هەوڵدەدەن وەلامی ئەو جۆرە پرسیارانە بدەنەوە ، ئەو دەقانەش کە هایدگەر کاتێك ڕاگری زانکۆی " فرایبۆرگ " بووە ، نووسینی یان وتوونی بخاتەڕوو ، یان ئەو سەردەمەی کە سۆسیال ناسیۆنالیستەکان دەسەڵاتیان وەرگرت ، کە بەشێکیان پشتیان پێ دەبەست بۆ ( تۆمەت بار)کردنی هایدگەر بە چوونە پاڵ نازییەت.

(١) دەربارەی ئەوەی هایدگەر لە گوتاری کەلە بەردەم خوێندکارانی زانکۆی " فرایبۆرگ " لە ١٨ مایۆ/ ئازاری ١٩٣٣ داویەتی : لەسەر ئەوەی لە گوتاری ڕاوێژکاردا هاتووە ، جەخت لەوە دەکەمەوە کە گەلان ئازادی خۆیان هەیەو پێویستە ئێستا ئەو ڕێگایە دیاری بکەن کە بۆیان دەگونجێ، بەلام بۆ ئێمە ، بە باوەڕ بە خۆبوونەوە بڕیارمان داوە کە بە ڕێگای سەختدا بڕۆین، کە وای لێ کردووین پێیدا بڕۆین ، ئەمەش وەك وەفایەك لەلای ئێمەوە بۆ بەرپرسیارێتیمان بەرامبەر بەمێژوو. ئێستا ئێمە دەزانین کە هۆکارو زەمینەکانی ئەم بڕیارە ئەمەیە: ئامادەباشی تا ئەوپەڕی ئیمکان بوون و هاوڕێ بوو تا ئەوپەڕی ئاست ، با ئێستا پەلە بکەین لە کار کردن ، با کاری ئەم وەرزەمان ، بچووك یان گەورە ، ئاراستە بێت بۆ ئەو ئامادەباشیەو ئەو هاورێیەتیە .

(٢) لە یادی ئەلبێرلیۆ شلاگتار (١) Albertleoschlagtar لە نێوەراستی کارەکەماندا ، لە میانەی ماوە کورتەکانی پشووداندا ، لە سەرمانە ئەو خوێندکارەی ( فرایبۆرگ ) مان لە یاد بێت ، کە ( ئەلبێرلیۆ شلاگتار ) ە کە وەك گەنجێکی ئەڵمانی بەر لە ١٠ساڵ مرد ، مردنەکەی زۆر سەخت و گران و بالاگەردان بوو، وەك وەفایەك بۆ شکۆمەندی دەمانەوێ ڕابمێنین و کەمێك لەو مردنە قووڵ بینەوە ، لە میانەی ئەو مردنەش دەمانەوێ لە ژیانمان تێ بگەین . مردنی شلاگتار ، مردنێکی زۆر سەخت بوو ، مردن لە هێڵەکانی تەماسی شەڕ لە پێشەنگی تابووری تۆپخانەدا .. نا ، مردن لە هەڵمەتی هێرشبردندا.. نا ، یا لە خۆگری و سەختی بەرگریدا .. نا ، بەڵکو چونکە ئەو بە پێوەو بە بێچەك لە بەرامبەر تفەنگی فەڕەنسییەکاندا مرد . کەچی ئەو لەگەل ئەوەشدا بەرەنگارو خۆڕاگربوو لە بەرامبەر تاقیکردنەوەی سەختتردا .ئەگەرچی ئەمە دەکرا لە کاتی ژاوەژاوی خۆشی بەرگە بگرێ کە سەرکەوتنێك بە دەست هاتبا ، کاتێك گەورەیی میللەتێك کە لە سەرەتای سەر هەڵدانیەتی درەوشابایەوە. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ، ئەوە ئێمەین لە بەردەم زوڵمەت و خیانەت و بێ ئابڕووی داین لەبەر

ئەو هۆیە، لەسەری بوو کاری زیاتر گەورەو زیاتر سەخت تەواو بکات ، بە تەنها لە سەری بوو وێنەی راپەڕینی ئاییندەی گەل بە دەربخات. لە پێناو شەرەف و گەورەیی ، کە نمایندەی بکات و بمرێت، ئەو باوەڕدارێك بوو ، کە زۆرترین ئیمانی بەوە هەبوو. مەتینی ئەو ئیرادەیەی لە کوێوە بوو بۆ ئەوەی بەرگەی ئەو سەختییە بگرێت ؟ ئەو دڵپاکیەی لە کوێ بوو بۆ ئەوەی نمایندەی زیاترین گەورەیی و دوور روانی بێت؟ ئەی خوێندکاری (فرایبۆرگ ) ، ئەی خوێندکاری ئەڵمانی ! لە سەرتە شانازی پێوە بکەی و ئەوە بزانی کە تۆ هەیت ، لە میانەی گەڕان و ڕێپێوانە درێژەکانەوە پێیەکانت دەخەیتە سەر زەمینی چیاکان و دارستانەکان و دولأییەکانی (دارستانی ڕەش) ، پێ دەخەیتە سەر ئەو زەمینەی کە ئەو پاڵەوانەی بەرهەم هێناوە. بە بێ چەك ، پاڵەوانەکە ڕوانینەکانی خۆی راوەشاند ، لە بەرامبەر تفەنگە ئاراستەکراوەکانی بەرامبەری ، دەستەملانێی رۆژەکان و چیاکانی وولأتەکەی بوو تاوەکو بمرێت و چاوەکانی جێگیر بن لە سەر زەمینی ئەڵمانیاو لە سەر خەڵکی ئەڵمانیاو رایخ.

(٣) کورتکراوەی وانەی هایدگەر کە لە " هایدلبارگ"و لە ڕۆژی ٣٠ حوزەیرانی ١٩٣٣ دا گوتوویەتی : ئێستا ئێمە رایخێکی نوێمان هەیە، زانکۆمان هەیە ، ئەو زانکۆیەی کە دەبێ ئەرکەکانی و کارەکانی کە لە ئیرادەو وجودی ڕایخدان ، قبووڵ بکات . ئەمە شۆڕشێکە لە ئەڵمانیا ، لە سەرمانە پرسیار بکەین: ئاخۆ ئەمە شۆڕشێکیشە لە زانکۆ ؟ نەخێر ململانێکە تا ئێستا جگە لە هەندێ زەمینە خۆشکردنی پێشینەی نەبەزاندووە ، تا ئەو کاتەی ئێستاش هیچ شتێك ڕووی نەداوە جگە لە پێشکەوتن . لە میانەی ئامادەکردنی ژیانی نوێ لە ئۆردوگاکانی کاردا ، لە کۆمەڵبوونە زانستیەکاندا ، هەندێ لە ئەرکە پەروەردەییەکانمان لە سەر خوێندنگای باڵا هەڵگرتووە ، کە پێشتر بە تەنها پێی هەڵدەستا ، لەوانەشە زانکۆ بە هۆی لەبیر چوونەوە بمرێت ، ئەو هێزە پەروەردەییو فێرکردنیەی هەیەتی لە دەستی بدات . بەڵام دەبێ سەر لە نوێ لەگەڵ کۆی خەڵك یەکبگرێتەوەو بە دەوڵەتەوە ببەسترێتەوە . لە سەر زانکۆیە سەرلەنوێ هێزێکی پەروەردەیی نوێ بێت ، لە ڕێگای زانستەوە چینی دەسەڵاتداری دەوڵەت بۆ ئاستی زانست بەرز بکاتەوە . ئەو ئامانجەش سێ شتی گەرەکە : (١) مەعریفەی ئێستای زانکۆ .(٢) زانینی ئەو ترسناکیانەی کە ئەمڕۆ و سبەی هەرەشەمان لێ دەکەن . (٣) بوێری نوێ . تا ئێستا ئێمە بە لێکۆڵینەوە هەڵدەستین ، لە زانکۆ خوێندکاران فێر دەکەین ، دەیان ساڵە ئێمە ئەو ڕێگایەمان گرتۆتە بەر .. بێ شك فێربوون لە لێکۆڵینەوە سەر هەڵدەدات ، هەوڵمان دەدا هاوسەنگیەکیان لە نێواندا بدۆزینەوە . لە میانەی ئەو

تێگەیشتنە بۆ زانکۆ ، هیچ ڕایەك نەبوو ، تەنها ڕای مامۆستا نەبێت ، هەرگیز وەك یەکەیەك گرنگی بە زانکۆ نەدرا . لێکۆڵینەوە سنورێکی نەدەزانی ، گومانەکانی لە پشتی بیرۆکەی گەشەسەندنی جیهانیانەی زانست حەشار دەدا .. لەو کاتدا بێ ئامانج بوو، فێرکردن بووە شتێکی حەتمی لە پشت ئەو ڕێو شوێنانەی کە دەربارەی تاقیکردنەوەکان دەگیرایە بەر . لە بەرامبەر ئەو ڕەوتەدا ، لە نێو فیکری سۆسیال ناسیۆنالیستدا بنەمای ململانێی توند ڕەوانە پێك هاتن، نەدەکرا لە ڕێگای بیرۆکەی مرۆدۆستی و یان مەسیحیەتەوە رابگیرێ .. ئەو بیرۆکانەی کە زەڕوورەتی ڕەهای خۆیان لە ئاسانکردنەوەیەکی گشتی وەردەگرت . کە دیسانەوە نەدەکرا ، بە هەر حاڵ ئەوەی ئێمە دەمانویست ، ئەوەی نوێیە لەبەر چاوی بگرین ، تا ئەوە زیاد بکەینە سەر هەموو شتێکی روونکردنەوەی سیاسیانە . نەخشە دانانەکان و فەرمایشتەکان و دروشمەکان کە پێویستیان بە شتێك نییە، ئێستا لە هەموو شوێنەکاندا سەردەردەکەن ترسناکیەکی بێ وێنەیەو جگە لە وەهم دەربارەی دەروون هیچی تر نابێت ، بە تەواوی وەك " تێگەیشتنی نوێ بۆزانست " ، ئەوەی کە دەڵێ هیچ شتێکی نوێ نییە جگە لە کۆن کە پشت ئەستوورە بە سەرچاوەو ئاشکراکردنی ژێدەری ئەنترۆپۆلۆژی . هەموو ئەوە زێدەڕۆییە دەربارەی "سیاسەت " ، ئەمەش هەموو



پووچی و بەتاڵیە ، چونکە ئێمە ناتوانین ئاستەکانی کۆنمان لە ڕێگای ئەو جۆرە شتانە بگۆڕین .. تاقیکردنەوەی شتەکان ئاسایی و بنەڕەتیە، بەرەنگاربوونەوەی بارو مەرجی واقیعیانە زەڕوورەتن بۆ جددیەتو حەقیەتی ئەو شتە نوێیە . یەکەی کردار کە لە پابەند بوونی نێوخۆیی سەر هەڵدات بە نیسبەت ئاییندە گەواهی ئامێزن ، گوێمان لە هەندێك کەس دەبوو دەیان گووت : " زانست لە خەتەر دایە بە هۆی بە فیرۆ چوونی کات، ئەم بە فیرۆچوونەی کە لەدەرئەنجامی مەشقی بەر گریکردنەوەیە " بەڵام " بە فیرۆچوونی کات" مانای چییە ، ئەگەر تەنها مەسەلەکە پەیوەندی بە زەڕوورەتی بەرگریکردن لە دەوڵەت و لە پێناوی دەوڵەتدا بێت ؟ لە کارکردن لەپێناو دەوڵەتدا هیچ مەترسیەك بەرەنجام نایەت ، مەترسی تەنها لە کەمتەرخەمی بەرامبەر خۆڕاگری و بەرەنگاربوونەوە بەرەنجام دێت . لەبەر ئەوە هەر دەبێ بۆ هێزی ڕەسەنو حەقیقەت، توانای دەستپێکردن لە ڕێگای ڕاست بەرجەستە ببێت .. ناشبێت هیچ جێگایەك بۆ چارەسەری مامناوەندی بمێنێتەوە . ئازایەتی و بوێری نوێ هەموو ئەو مەترسیانە بە ئاشکرا بە دەردەخات. بە تەنهاش توانای ئەوەی هەیە کە چاو بەسەر هەموو شتێکدا بکاتەوە کە کائینەو کەچیش دەبێت . ئەمەش هەموو مامۆستایەك و هەموو قوتابیەك دێنێتە ژێر





ئـەو بـارەی کـە لـە مەسەلە بنەڕەتییەکانی زانست بگەنە یـەك لایـیکردنەوە . ئـەو جـۆرە بـڕیارانەش زۆر کۆنـن. ئەمـە بە تەنها بۆ ئێمەی ئەڵمانی ئەوە ئاشکرا دەکات کە ئـاخۆ ئارەزوومانـە بـەوەی بـە تـەواوی مانای بەرزی وشە بـبین بە " گەلی زانست". فێربوونی نوێ، بە تەنها مانای بەشداریکردنی زانـیاری نـیـە ، بـەڵکو کـەوا ڕێگا بدەین خەڵك فێربن ، بیانجولێنین بۆ ئەوەی فێر بن.

(٤)بانگـەوازێك لـە پێـناو ریفـراندۆمی ١٢ی نۆڤێمـبەر/ تشرینی دووەمی سالی ١٩٣٣

مامۆستا بەڕێزەکان

هاوڕێیانی ئەڵمانی !

هاوڵاتیان ...

گـەلی ئـەڵمانی بـۆ سـەر سندووقی هەڵبژاردن و لـە لایــەن "ئەلفۆهــرەر" بــانگ کــراوە ، بــەلام ئــەوە بانگەشــەیەك نیــیە " ئەلفۆهــرەر" ئاراســتەی گــەلی کردبێت . بەڵکو ئەمە پێدانی توانای بەپەلەی‌خەڵکە بۆ بـڕیاردانی ئـازادو زێدە سەربەرز : کەواتە گەل بە گشتی بــڕیار دەدات لەمــەڕ ئـەو شــتەی کـە دەیەوێـت و ئـەو شتەشی کـە نایەوێـت . بـەیانی گەل ئەوەی دیاری دەکات تـەنها ئایـندەیەتی . ئـەو هەڵبژاردنە دەبێت بەبێ ئەوەی هەرگـیز بـەراورد بکرێت لەگەڵ هیچ هەڵبژاردنێك کە تا ئــەو کاتــە ئــەنجام درا بێــت . تاکــە لایەنــێك لــەو هەڵبژاردنەدا ، کە لە بنەڕەتدا جەختی دەکاتە سەر، ئەو گەورەیـیە سادەیەی بـڕیارەکەیە کـە دەدرێـت .. بـەلام مەتیـــنی ســادەیی و کۆتـــایی ، ڕەحــم بــەدوودڵی و خۆپـارێزی ناکـات . ئـەو بـڕیارە کۆتایـیە دەگاتـە ئاسـتی ئەوپـەڕی وجـودی گەلەکەمان ، ئەو ئاستە چییە ؟ خۆی لـە زەرووڕەتـی حـەتمی دەبینێـتەوە بـۆ هەر کائینێك کە پارێزگاری لـە جەوهـەری ڕەسـەنی خـۆی بکات و لەوێدا نــێوبەندێك بوونـــی هەیــە لــە نــێوان ئــەوەی مــافی گەلەکەمانـەو ئـەبێ داوای بکـەینو ئەوەشی مافمان نیـیە داوای بکـەین . بـە پـێی ئـەو یاسا جەوهەریـیە ، گـەلی ئـەڵمان پارێـزگاری لـە کەرامـەت و ئـارامی ژیانی دەکات . ئـیرادەی پارێــزگاری لــە خــۆ کــردن تــەنها یاســایەکی جەوهـەری نـیـە بۆ بوونی گەلەکەمان . بەڵکو لە هەمان کاتدا ڕووداوێکی بنەڕەتیە کە دەرەنجامی هاتنی دەوڵەتە سۆسیال ناسیۆنالیستەکەیەتی .

ئەمــە تەماحــێك نیــیە ، هــەروەك گــەرە لاوژەی ســەرکەوتن نیــیە ، هـەروەك یاخیبوونـێکی کوێـرانەش نییە ، تێنوێتـیش نییە بۆ دەسەلات .. هەموو ئەمانەش نەبوون بوونە هۆی ئەوەی " ئەلفۆهرەر " لە "کۆمەڵەی گـەلان " بکشێتەوە ، بەڵکو تەنها ئیرادەی ئاشکراو روونە، ئـەو ئیرادەیـەی کـە دەیەوێت بەرپرسیارێتی بـەبێ هیچ مەرجێك لـە بەرامـبەر چارەنوسی گەلەکەماندا تەواو لە ئەسـتۆ بگـرێ ، ئەمـە بەهـیچ شێوەیەك بەو مانایە نییە کـە ئـێمە دەمانەوێـت خۆمـان لـە تـەواوی گـەلانی دیکـە دابـڕین، بـەڵکو بـە پێچـەوانەوە دەمانەوێـت لەمـیانەی تـەواو کـردنی ئـەو هـەنگاوە ، گەلەکەمان شوێنگەیەك لە ژێـر سایەی ئەویاسا جەوهەریـیەی بەشـەرییەتدا بگـرێ کە مرۆڤی پێ جیا دەکرێتەوەو لە سەر هەموو گەلێك لە گـەلان پێویستە کـە ئاگای لێ بێت ئەگەر بیەوێت ببێتە گەلی ئێمە .. بژی هیتلەر !

# گۆڤاری "دێر شبیگل "
# لەگفتوگۆیەکدا لەگەڵ مارتن هایدگەر

**چ: رۆدۆلف ئەگستاین، گیۆرك فۆلڤ**

ئەوگفتوگۆیە لەگۆڤاری "دێر شبیگل"ی هەفتەنامەی ئەڵمانی لەبەرواری ٣١مایۆ / ئایار ی ١٩٧٦بەچەند رۆژێك دوای مردنی مارتن هایدگەر بڵاوبۆتەوە گۆڤارەکە ئەو روونکردنەوەیەی بڵاوکردۆتەوە : هایدگەر لەمانگی مارس ١٩٦٦ نامەیەکی بۆ گۆڤارەکە ناردووە تیایدا وەڵامی ئەوانە دەداتەوە کەتۆمەتباری دەکەن بەپەیوەندی بوونی بەنازیەکانەوە لەماوەی سەرکەوتنیدا . ئەم نامەیە ئاماژە بوو بۆ ئەوەی کە ئامادەیە بۆ وەڵامدانەوەی هەر پرسیارێك کە پەیوەندی بەو مەسەلەیەوە هەبێت . لەمانگی سێتمبەر "١٩٦٦( رۆدۆلف ئەگستاین و گیۆرك فۆلڤ ) توانیان ئەم گفتوگۆیە لەگەڵ هایدگەردا بکەن . ئەوەشی کردە راسپاردە کەنابێ ئەم گفتوگۆیە تاوەکو مردنی بڵاوبکرێتەوە بەوەی دەڵێت : مەسەلەکە پەیوەندی بەلوتبەرزیو کەللەرەقیەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بەکارەکەمەوە هەیە کە لەگەڵ ساڵەکاندا ئاسانتر بووە ، مانای ئەوەیە لەبواری فیکریدا ئەوا زێدە سەختە ". ئەو چاوپێکەوتنە زۆر دەگمەنەی کەوا هایدگەر تایبەتی کردبوو بە رۆژنامەوانی. لێرەوە ئەم چاوپێکەوتنە وەك لەگۆڤاری (فکرو فن)دا هاتووە ، بەشێکەو ، تیایدا هایدگەر هەوڵ دەدات ئەو ( تۆمەتانە ) روونبکاتەوە کە هەندێ کەس ئاراستەیان کردووە بەبوونی پەیوەندی لەگەڵ ( رایخی سێیەم ).

شبیگل: مامۆستا هایدگەر ، تێبینی ئەوەمان کردووە کەهەموو کاتێك شتێك هەیە کاریگەری بەسەر کارە فەلسەفەیەکانتەوە هەیە، بەهۆی ئەو رووداوانەی تیایدا ژیاییت ، لەگەڵ ئەوەی ئەو رووداوانەش درێژەیان نەکێشا کەچی وەك ئەوەی پێویست بوو روون نەبوون؟

هایدگەر : مەبەستان رووداوەکانی ١٩٣٣یە .

شبیگل: بەڵێ پێش ١٩٣٣و دواتریش ، ئێمە دەمانەوێت ئەم رووداوانە لەچوارچێوەیەکی زیاتر فراوان دابنێن ، لێشیەوە بەرەو پرسیاری زیاتر گرنگ بچین .

بۆ نمونە : تواناکانی فەلسەفە چین بۆ کاریگەر بوون بەسەر واقیعدا ، بەواقیعی سیاسیشەوە ؟

هایدگەر: ئەمە پرسیار گەلێکی گرنگە ، ناشزانم دەتوانم وەڵامی هەموویان بدەمەوە یان نا . پێش هەموو شتێك دەبێ ئەوە بڵێم کە هیچ چالاکیەکی سیاسیم نەبووە بەر لەدامەزرانم بەسەرۆکی زانکۆ و لەماوەی زستانی ١٩٣٢... زستانی ١٩٣٣کەوا لە پشوودان بووم ، زۆربەی کاتەکەشم لەماڵە لادێیەکەم بەسەر برد.

شبیگل : کەواتە چۆن توانیت ببیتە سەرۆکی زانکۆی فرایبۆرگ؟

هایدگەر: لە ماوەی مانگی دیسێمبەری ١٩٣٢ "فۆن مۆلوندرۆف" ی هاوڕێم کە مامۆستای پسپۆر بوو لەزانستی توێکاری بوو بەراگر، مێژووی دەست پێکردنی کار لەزانکۆکەمان لە رۆژی ١٥ی ئیبریل لەکاتی وەرزی زستانی ١٩٣٢-١٩٣٣بوو، هەندێك جار بەیەکەوە قسەمان لەبارومەرجی سیاسیو بەتایبەتی بارودۆخی زانکۆکان دەکرد ، هەروەك باسی بارو ژیانی نادیارو تەماویی خوێندکارانمان دەکرد . رای من بەو شێوەیە بوو : هیچ رێگا چارەیەك نییە جگە لەو رێگا چارەیەی کە پابەندبین بەو رەوتەی بە شێوەیەك لە شێوەکان دەستی بەسەر هەڵدان کردووە بە پیشتیوانی ئەو هێزە داهێنەرەی کە تاوەکو ئێستا زیندووە ؟

شبیگل: کەواتا تێبینی پەیوەندی لەنێوان بارودۆخی زانکۆکانی ئەڵمانیاو هەلومەرجی سیاسی ئەڵمانیات بەشێوەیەی گشتی کردبوو ؟

هایدگەر: لەماوەی نێوان مانگی ینایەرو مارسی ١٩٣٣ چاودێری رووداوەکانم دەکرد ، ئەو رووداوانەش کە لەبارەیەوە لەگەڵ هاوڕێکانم قسەم لەسەر دەکرد ، ئەو هاوڕێیانەی بەتەمەن لەخۆم بچووکتر بوون ، وەلێ کارەکەم لەو وەختەدا تایبەت بوو بە شرۆڤەکردنی بەرفراوانی فیکری بەر لەسوقرات . پێش ئەوە مامۆستا "فۆن مولدندرۆڤ" لە ١٧ی ئیبریل وەك راگر دەستی بەکارکردنەکەی کرد . تەنیا بەدوو هەفتەش دوای ئەمە بەبڕیارێك لەلایەن وەزاروتی پەروەردە لەو پۆستە لابرا. لەوانەشە ئەو کات بڕیاری سەرۆکی زانکۆ بەرێگاگرتن بەهەڵواسینی بڵاوکراوەیەکی دیواری یەهودییەکان ، هەلی دایە دەست وەزارەت بۆ ئەوەی لەپۆستەکەی لاببەن .

شبیگل: بەرێز فۆن مولۆندرۆڤ سۆسیال دیموکرات بوو، چی کرد لەکاتی ئەو بڕیارەدا ؟

هایدگەر: رۆژی لابردنەکە فۆن مولۆندرۆڤ پەیوەندی پێوە کردمو پێی گوتم : " هایدگەر تۆ دەبێ سەرۆکایەتی زانکۆ بگریتە دەست " پێم گوت من شارەزاییەکی وام لەکاری ئیداری نییە ، هەروەك جێگری سەرۆکی زانکۆ کە مامۆستا " شاور " (زانستی لاهوتی) بوو ، ئەوەی خستە رووم کەخۆم بۆ پۆستی سەرۆکی زانکۆ هەڵبژێرم، بەپێی گوتەی ئەو، ئەگەر وەزارەت کەسی دەست نەکەوێت باوەڕی پێ بکات ئەوا کارمەندێك

هەڵدەبژێرێت. هەروەك هاوڕێ بچووکەکانم لەتەمەندا هاتنە لام ، من تەمەنێکم هەبوو. وا روویدا بوو کە پێشتر لەسەر مەسەلەیەکی پەیوەست بەرۆیشتنی زانکۆ گفتوگۆم لەگەڵ کردبوون ، بەگڕو تینێکی گەورە داوایان لێ کردم ببم بەسەرۆکی زانکۆ. ماوەیەکی زۆر دوودڵبووم. دواجار قەبوڵم کرد بەو کارە هەڵسم ، تەنها لەبەر بەرژەوەندی زانکۆ ، ئەگەر دڵنیابم لەرەزامەندی هەموو ئەندامانی ئەنجوومەنی هەڵبژاردن . وەلێ گومان لەتوانای ئیداریم هەر تیا مابوو، تاوەکو ئەو بەرەبەیانەی کە تایبەت بوو بەهەڵبژاردن ، پەیوەندیم بەهاوڕێانم کرد لەنێوانیاندا فون مۆلۆندرۆڤ و شاور ، پێم گوتن کە من ناتوانم ئەو پۆستە بەرێوە بەرم. ئەو کاتە هاوڕێکانم پێیان راگەیاندم کە پرۆسەی هەڵبژاردن دەستی پێکردووەو، لەتوانامدا نییە خۆم لە پالاوتن بکێشمەوە .

شبیگل: بیگومان قبوڵت کرد، چی بوون ئەو گیروگازانەی لەپەیوەندیتدا بە سۆسیال ناسیۆنالیستەکان هەبوون ؟

هایدگەر: دوای دوو رۆژ لەدەست پێکردنی کارەکەم وەك سەرۆکی زانکۆ ، سەرۆکی خوێندکارە سۆسیال ناسیۆنالیەکان کەدوو هاوڕێم لەگەڵ بوون پەیوەندیان پێوە کردم داوای لێ کردم ڕێگایان پێدەم بلاوکراوەیەکی تایبەت بەیەهودییەکان هەڵواسن، رەتم کردەوە هەرسێ خوێندکارەکە دوای ئەوەیپێیان راگەیاندم بڕیارەکەم دەگەێننەوە سکرتاریەتی خوێندکارە سۆسیال ناسیۆنالیستەکان، رۆیشتن. بەچەند رۆژێك دوای ئەمە بەرێوەبەرایەتی خوێندنی بالاَ لە وەزارەتەوە بە تەلیفۆن پەیوەندی پێوە کردم داوای لێکردم کە رێگا بەهەڵواسینی بلاوکراوەکە بدەم هەروەك لەزانکۆکانی دیکە روویداوە. ئەگەر بهاتباو من رەتم بکردبایەوە ئەوا خۆم دەکەوتمە بەر لابردنو هەروەك داخستنی زانکۆش. ویستم قەبوڵی وەزیر وەربگرم بۆ بڕیارەکەم ، بەلاَم ئەوەی راگەیاند کەناتوانیً. لەگەڵ ئەوەشدا من لەبڕیارەکەم پاشگەز نەبوومەوە .

شبیگل: ئێمە تاوەکو ئێستا نازانیین کاروبارەکە بەو شێوەیە بوو بێت ؟

هایدگەر: ئەو هۆیە راستەقینەیەی کە پالێنام بۆ قەبولکردنی پۆستی سەرۆکی زانکۆ ، ئەو هۆیەیە لەوانە سەرەتاییەکەمدا لەزانکۆی فرایبۆرگ لەساڵی ١٩٢٩ رامگەیاند : " میتافیزیکا چییە ؟" بوارە زانستیە لێك دابڕاوو دوورەکان لەیەکترو رێگای شرۆڤە کردنی زانستی شتەکان جیاواز دەبێت لەوەی پێشتری، جیاوازییەکی توند لەهەموو جارێکدا . فرەیی لەنمونەی ئەو زانستە پەرشوبلاوانەی هیچ پەیوەندییەکی لۆژیکیان نییە ئەمرۆ ، تەنها ئەوە نەبێت کە رێکخستنی تەکنیکی زانکۆو کۆلێژەکان پیَی دەبەخشێ ، لەنێوان نمونەی ئەو تایبەتمەندیانە جگە لەیەك خالَی بەیەکگەیشتن

شــتێکی دیکــه نیــیه، کــه ئــەویش بەکارهێــنانی پراکتیکـیانەیەتی. لەبەرامـبەر ئەوەشـدا رەگ داکوتـانی زانست لەجەوهـەری بوونـیدا ، شتێکی تـەواو مردووە " هەموو ئەوەی هەوڵیشم بۆیدا لەماوەی سەرۆکایەتیم بۆ زانکـۆ لەبەرامــبەر بارومــەرجی ئـەو کـاتی زانکۆکـان هـەتاوەکو ئـەو شـێوە توندڕەوییـەی ئەمـڕۆی پێگەیووە - روونـە، روونـیەکی تـەواو لـەو گوتـارەی ڕۆژی دامەزرانم بەسەرۆکی زانکۆ گوتمەوە.

شبیگل: ئـێمە هـەوڵ دەدەیـن ئـەوە ئاشکرا بکـەین کـه چۆن‌و تا چ رادەیەك ئەو ئەو قسەیەت کە لەساڵی ١٩٢٩دا راتگەیاندووە لەگـەڵ ئـەو گوتـارەی یـەکتر دەگـرنەوە کـه لەئاهــەنگی دەمەزرانــت‌و لــه ســاڵی ١٩٣٣ راتگــەیاند. رستەیەك لەچوارچێوە گشتیەکەی دەردەهێنن :" ئازادی ئەکادیمـیایی ، لەگـەڵ ئـەوەی هەندێکـیان شـانازی پـێوە دەکــەن ، ئێســتا بەتــەواوەتی لــەزانکۆکانی ئەڵمانــیادا رەتکـراوەتەوە. چونکێ ئـەو شـێوە ئازادییە حەقیقەتێك نیـیە، وەلـێ تـەنها نێگەتیڤە ". لەو باوەڕە داین کە ئێمە لەسەر هەقین کەوا وێنابکەین ئەو رستیە گوزارشت لەو وێــناکردنانە دەکــات کــە تــا ئێســتا لێــیەوە نــزیکەو تائەمڕۆش لەگەڵی هاوکۆکە.

هایدگەر: مـن سورم لەسەر ئەوەی گوتوومە . بەوەی کە ئـەو "ئـازاد" یـە ئەکادیمیە لـە زۆربـەی جارەکان شتێك نـەبوو جگـە لەنێگەتـیڤی : ئازادی لەنەبوونی هەوڵدان‌و، لەنــەبوونی کــرانەوە بەســەر تــێڕامان، تــێفکرین‌و لێکۆڵـینەوە زانسـتیەکان دەیخـوازن . بـەلاّم لـەبارەی ئـەو رسـتیەی کـە ئامـاژەت پـێدا، ئـەوا نابێت بخوێنرێـتەوە ، چونکە دابـڕاوە لەچوارچـێوە گشتیەکەی، لەو چوارچێوە گشتیەشــدا تــەنها بۆمــرۆڤ دەکــرێ ، لــەوە تێــبگات کەمەبەستم چی بووە لەئازادی نێگەتیڤی.

شـبیگل: بـەڵێ . بـەلاّم ئـێمە لـەو بـاوەڕەداین لـەگوتاری سـەرەتاتەوە سـەدایەکی نـوێ هەیە کاتێك دوای چواردە مـانگ لـە هاتـنە سـەرکاری "هیتلەر " بۆ سەر دەسەلاّت وەك راوێژکـاری رایــخ ، قسـە لەسـەر " گـەورەیی ئـەو وەرچەرخانە " دەکەیت .

هایدگەر: ئەو کاتە رایەکەم بەوشێوەیە بوو.

شـبیگل: ئایـادەتوانی ئەمـەمان بـە شـێویەکی وردتـر بـۆ روونبکەیتەوە ؟

هایدگەر: بـێگومان لـەو کاتـەدا هیچ چارەسەرێکی دیکەم نـەدەدی ، لـەناو ئـەو نـێوەندە ئاژاوەیـیە گشـتیەی رەوتـە سیاسـیەکان کە ٢٢ پارت نمایندەیان دەکرد ، پێویست بوو پــەی بــە شــوێنگەیەکی نەتــەوەیی‌و بەتایــبەتی بەکۆمەلاّیـەتی بـبرێت ، بەئاراسـتەی گشتی بۆ هەوڵەکەی فـریدریك نومـان friedrichnaumann. بۆ نموونە دەمـەوێ ئامـاژە بـە لێکۆڵیـنەوەیەکی ئـادوارد سـپرانگیر edurdspranger ) بـدەم ، کەدوورتـر دەڕوات لـەو وتارەی لەئاهەنگی کردنەوەدا گوتمەوە.

شبیگل: لەچ کاتێکدا گرنگیت بەسیاسەتدا ؟ ئەو کاتەی پێش ئەمە ٢٢ پارتی سیاسی هەبوون ، هەروەك چەندین ملیۆن بێ کار هەبوون لەساڵی ١٩٣٠!

هایدگەر: لەو کاتەدا لەبنەڕەتدا گرنگیم دەدا بەو مەسەلانەی کەلە " وجودو زەمەن"دا sien und zeitهاتوون . بەو نووسینو وانانەش کە لەساڵی دواتر گوتمنەوە . مەسەلەی فیکری بنەڕەتی بوون لەسەر پەیوەندی ناراستەوخۆ بەپرسە نەتەوەییو کۆمەلأیەتیەکان. ئەو پرسەش کە زیاتر جێگای پێداگرتنی من بوو وەك مامۆستایەکی زانکۆ لەو کاتەدا پرسی چارەنووسی زانستو ئاراستەکانی بوو ، هەروەك پرسی نوێکردنەوەی زانکۆو کارەکانی بوو . ئەو باسەش روونبوو لەناونیشانی گوتاری ئاهەنگی دامەزراندن : " خۆسەلماندنی بوونی زانکۆکانی ئەڵمانیا " ئاهەنگی دامەزراندت ئەو کات بۆ خستنەرووی ئەو ناونیشانە نەکرابوو بەلأم لەو کەسانەی فێڵیان لەو گوتارەیان کردوو رەخنەیان لێ گرت..خوێندبوویەوەو بەباشی تێڕامابوو، لەهەلومەرجی ئەو قۆناغەدا راڤەی کرد ؟

شبیگل: خۆ سەلماندنی بوونی زانکۆکانی ئەڵمانیا ، لەهەر دونیایەکی سەرەو ژێربوودا ، تەنها ئەوەیە کە لەکات شوێنی خۆیدا نەبووە؟

هایدگەر: ئەمە چۆن بوو ؟ " خۆسەلماندی زانکۆ بۆ بوونی خۆی " ئەمەیان لەگەڵ ئەوەی کە ناوی " زانستی سیاسیە " ناجوور بوو ، ئەوەی لەو کاتەدا لەناو حزبو لەنێو ئاستی خوێندکارە سۆسیال ناسیۆنالیستەکاندا جێگای داوا کردن بوو . ئەو ناونانە " زانستی سیاسی" ماناکەی بەتەواوەتی جیاواز بوو لەمانای ئەمرۆ . مانای تەنها خودی سیاسەت نەبوو بەڵکو مانای ئەمە بوو :" زانستی راستەقینە ئەوەیە کە سوودی بۆ گەل هەبێتو ئارەزووەکانی بەدەست بهێنێ. ئەوەی لەگوتاری کردنەوەدا ئاماژەم پێدا بەتەواوەتی ناکۆكو دژ بوو لەگەڵ ئەو ئاراستە "یەی بەسیاسی کردنی زانست.

شبیگل: ئایا ئێمە بەباشی تێدگەین ؟ ئایا تۆ دەتویست لەو کاتەدا جەخت لەسەر رەسەنێتی زانکۆ بکەیتو بیپارێزێ لەو رەوتە بەهێزانەی کە هەڕەشەیان لێ دەکرد؟

هایدگەر: بەلێ... هەروەك لەبەرامبەر رێکخستنی تەکنیکانەی زانکۆ،بیگومان دەبێت مانایەکی دیکەی نوێ هەبێت بۆ خۆسەلماندن ، دەستپێك لەبیرکردنەوە لە تەقالیدی فیکری رۆرژئاوایی ئۆروپی .

شبیگل: بەرێز مامۆستا .. ئاخۆدەکرێ وا لەقەسەکانت بگەین ، کەتۆ ویستووتە زانکۆ بەهاوکاری سۆسیالیست ناسیۆنالیستەکان رزگار بکەیت؟

هایدگەر: ئەو تێگەیشتنە هەڵەیە ... نا بەهاوکاری لەکەڵ سۆسیال ناسیۆنالیستەکان زانکۆ هەردەبێ نوێ ببێتەوە دەسپێك لەخودی خۆیەوەو ئەو شوێنگە





بەهــێزو پــتەوە بەدەســت بێنێــت .. لەبەرامــبەردا "بەسیاسی کردنی "زانست بەومانایەی کە پێشتر روونم کردەوە .
شبیگل: لەبەر ئەوە تۆ لەگوتاری کردنەوەدا ئاماژەت بەسێ گۆڵەگەدا : کار، بەرگری ، مەعریفە.
هایدگەر: هیچ کۆڵەگەیەك لەئارادا نییە ، ئەگەر ئێوە باش تێرامابن ، ئەوا مەعریفە ئاستی یان پلەی سێیەم وەردەگرێ ، بەڵام لەرووی ماناوە پلە یەکە. ئەوەی پێویستە تێیڕابمێنن، کاروبەرگریە وەك هەر چالاکیەکی مرۆیی دەسپێك لەزانستێکەوە دامەزراوە. بەوە رۆشن دەبنەوەو بەویش موژدە بەخش دەبن.
شبیگل: هەر دەبێ قسە بکەین دوای ئەمەش لەئاماژەدان بەو بەڵگە هێنانەوەی دەبینەوە - لەو رستەیەی پێشبینی ئەوە ناکەین کە ئەمرۆ پێی رازی بیت.
لەپایزی ١٩٣٣ گوتت: " ناکرێ تیۆرو فیکرەکان بنچینەی بوونت بن. تەنها " ئەلفۆهرر" ئێستاو ئایندە و واقیعی ئەڵمانیو یاسایەکەیەتی ".
هایدگەر: ئەو رستەیە لەگوتاری ئاهەنگی دامەزراندندا نییە، بەڵکو لە رۆژنامەی نێوخۆ یی " خوێندکارانی فرایبۆرگ "دایە . ئەمەش لەسەرەتای وەرزی خوێندنی زستانی ١٩٣٣-١٩٣٤دا کاتێ قبوڵم کرد ببمە سەرۆکی زانکۆ ئەوەم دەزانی کەدەبێ هەندێك دەستبەرداری پێشکەش بکەم . من ئەمرۆ هیچ رستەیەکی دیاریکراو نانوسم‌و بە هیچ شێوەیەك شتی وام نەگوتووە لەوەتەی ساڵی ١٩٣٤.
شبیگل: ئایا دەتوانین پرسیارێکی چاوەڕوان نەکراوت لێ بکەین ؟ ئێستا ئەوگفتوگۆیە ئەوە روون دەکاتەوە کە هەڵوێستت لەماوەی ساڵی ١٩٣٣دا لەنێوان دوو ئاراستە دا بوو. یەکەمیان ناچار بوویت هەندێك شت بڵێیت ، ئەمەیان ئاراستەی یەکەم بوو . بەڵام ئاراستەی دووەم زیاتر پۆزەتیڤانە بوو ، ئەمەش لەکاتێکدا کە دەڵێی : " هەستم دەکرد کە شتێکی نوێ هەیە . لەم نێوەدا دەسپێکێك هەیە "
هایدگەر: ئەوە مەبەستم بوو . وام قسە نەدەکرد کە دروستکراو بێت ، بەڵکو من بەهەق ئەوتوانایەم دەبینی.
شبیگل: تۆ دەزانی کە بەدەسپێکردن لەم شتانەوە وا تاوانبار کرای کە تۆ پەیوەندیەکت هەبووە لەگەڵ سۆسیال ناسیۆنالیستەکان‌و کۆمەڵەکانیان. ئەو جۆرە تۆمەتبارکردنانەی گەیشتنە جەماوەرێکی بەرفراوان‌و، تاوەکو ئێستا بێ هیچ روونکردنەوەیەك ماونەتەوە. لەم نێوەدا هەندێك هەن‌وا تاوانبارت دەکەن کەهاوپشتیت کردووە لەپرۆسەی سوتاندنی کتێبەکان کە قوتابیە هیتلەرییەکان رێکیان خسن.
هایدگەر: رێگام لەپرۆسەی سوتاندنی کتێبەکان گرت ، کەوا لەبەردەم باڵەخانەی زانکۆدا روویدا.

شـبیگل: دیسـانەوە هـەندێك تاوانـبارت دەكـەن كـەوا لەكتێـبخانەی زانكـۆو كـۆری فەلسـەفەدا بەرهـەمی نووسەرە یەهودییەكانت دەرهێناوە ؟

هایدگـەر: وەكو سەرۆكی كۆرەكە هیچ دەسەلاتێكم نەبوو جگـە لەسـەر كتێـبخانەكەی نەبێـت. هـیچ كـات چـۆكم دانـەدا لەبەرامبەر فەرمانە دووبارەكاندا ، كە پێداگیریان دەكـرد لەسـەر زەرووڕەتـی لەناوبـردنی نووسـراوو بەرهەمی یەهودیەكان ، هەندێك لەوانەیش كەلە كۆنەوە بەشداریان لەهەندێ كارەكانمدا كرد ، لەكۆری فەلسەفەدا ، لەتوانایاندایـە گـەواهی بـدەن لەسـەر ئـەوەی كـە ئـێمە بەرهـەمی یەهودیـەكانمان دەرنـەهێـنا. بـەڵكو گفتوگۆمان لەسـەر كارەكـەی ئـەوان دەكـرد ، بەتایـبەتی كارەكـانی هۆسرڵ hussel گفتوگۆیان لەسەر دەكراو راڤەدەكران ، وەكو چۆن پێش ساڵی ١٩٣٣ لەئارابوو.

شـبیگل : كەواتـە چـۆن هۆكارەكـانی بلاْوبوونـەوەی ئـەو تۆمەتانـە راڤەدەكـەین؟ ئایـا ئەوانـە پیسـیو دوو زمـانی نیین ؟

هایدگـەر: لەبەرئـەوەی سەرچـاوەكەی دەزانم ، نـاتوانم نكۆڵـی لێ بكـەم . بـەلاْم هۆكارەكـانی دووزمـانی لـەوە قوڵـترن. رازی بـوونم بەسـەرۆكی زانكـۆ تـەنها هەلـێك یـاخود هۆكـاری سـەرەكی نـەبوو لەروودانی ئەو شتەدا . بۆیە هەر كاتێك دەرفەت رەخسابایە ئەم گفتوگۆیە گەرم دەبووەوە .



شـبیگل: دوای سـاڵی ١٩٣٣ خوێـندكاری یەهودیت هەبوون، پەیوەندیت بە هەندێكیانەوە پتەو بوو.

هایدگـەر: هەڵوێستم لە ساڵی ١٩٣٣ ەوە نەگۆڕاوە . یەكێك لەخوێـندكارە كچـەكانم كـەناوی (هـێلن فـایس helen weiss) زێدە پێگەیشتووبوو ، دوای ئەوەی رێگایان نەدا لـەزانكۆی فرایـبۆرگ بـەو كـارە هەڵسـێ، بەمەبەسـتی وەرگرنـتی بـڕوانامەی دكـتۆرا بـەرەو سكوتلەندا كۆچـی كـردو لـەزانكۆی "بـال" نامەكـەی پێشكەش كـرد، نـاوی نامەكەیشـی :" هۆكارگـەرایی رێكـەوت لەفەلسـەفەی ئەرستۆدا " بـوو ، كـەوا سـاڵی ١٩٤٩لـە (بـال ) دەرچـوو . لەپێشـەكەی نامەكەشـدا نوسـیویەتی : " هـەوڵی راڤەكـردنی فینۆمیـنۆلۆژیانە كـە بەشـی یەكـەمی لێ پێشـكەش دەكـەم هـەندێ راڤـەكاری هایدگـەر هاوكـارم بـوون بـۆ هەڵسـان بـەم كـارە كـەتاوەكو ئێسـتا دەربـارەی فەلەســەفەی گــریكی بلاْونەكـراونەتەوە ". ئەمـەش دانەیـەكی ئـەو نامەیەیـە لەگـەڵ پێشكەشـكردنیدا ، چـەندین جـار سـەردانی خـاتوو ( فـایس) م كـرد پـێش مردنی .

شـبیگل: بـۆ ماوەیـەكی زۆر هـاوڕێی (كـارل یـانس بـرس) بوویـت ، دوای ١٩٣٣هاوڕێیەتـیەكەتان درزی تـێكەوت . پـروپاگەندەكان ئـەوە دەڵێن كـە هۆی ئەو درز تێكەوتنە ئـەوە بـوو كـەژنی (یـاس بـرس) یـەهوودی بـوو . ئایـا دەتوانی شتێك لەبارەی ئەم بابەتەوە بڵێیت؟

هایدگــەر: هــاوڕێی (یــاس بــرس) هــەر لەســاڵی ١٩١٩ەوە ســەردانم دەكــردو لــە (هــایدل پــارك) لــەماوەی وەزری هاویــنی ١٩٣٣ ســەردانی خــێزانەكەیم كــرد (یــاس بــرس) هــەموو كتێبەكانی لە ( نێوان ١٩٣٤-١٩٣٨) لەگەڵ سلاوێكی هاورێیەتی بۆ ناردم .

شــبیگل: خوێــندكاری (هۆســرل) ی فەیلەســوفی یــەهودی بوویــت كــە وانــەی فەلســەفەی لــەزانكۆی فرایــبۆرگ دەگوتــەوە . دوای ئــەوەش فەرمانــیدا بەدامەزراندنــت لەزانكۆ. ئایا دان بەچاكەكەی دادەنێیت ؟

هایدگەر: ئێوە ئەو پێشكەشكردنەی من لەكتێبی (بوون و زەمەن) دا دەزانن .

شبیگل: بێگومان . بەلام دوای ئەوە پەیوەندیەكت ترازا ، ئایا دەتوانـی یـان حـەز دەكەیت شتێك بلێت  لەوەی كە رووی نەداوە ؟

هایدگەر: جیاوازیـیەكان لـەبارەی پرسـە جەوهەرییەكان توندوكەڵەكـە بـوون . لەسـەرەتای سـیەكاندا (هۆسـرل) بــەرەو ئــەوە چــوو كــە بەپرۆســەی یەكلاكــردنەوەی حیسباتەكانی لەگـەڵ (ماكس شیلەر ) و بەئاشكرا لەگەڵ مــندا جێــبەجێ بكـات . لـەتواناشمدا نـەبوو درك بـەو هۆكـارە بكـەم كـە پـاڵی بـە (هۆسـرل)ەوە نـا بـۆ بیرۆكـە فەلسەفیەكانی من بەئاشكرایی .

شبیگل: لە چ بۆنەیەكدا ئەمە روویدا ؟

هایدگــەر: لەكۆشــكی وەرزشــدا لەبــەرلین (هۆســرل ) لەبەرامـبەر خوێـندكارەكاندا قسەی كرد. ئەریك موهسام Erich muhsam لـەبارەی ئـەو دەست تـێوەردانەی لەیەكێك لەرۆژنامە گەورەكانی بەرلین دا نووسی.

شـبیگل: دژایــەتی لــەخودی خۆیــدا زۆر گــرنگ نیــیە . بـەڵكو گـرنگ ئەوەیـە كە هیچ پەیوندیەكی بەوە نەبووە كە لە ساڵی ١٩٣٣دا روویدا .

هایدگەر: بە هیچ شێوەیەك .

شـبیگل: دەوتـرێ تـۆ لەسـاڵی ١٩٤١ لـەكاتی بلاوبوونـەوەی چاپی پێنچەمی (وجودو زەمەن)  بەئەنقەست  پێشەكی یەكەمت كە بۆ (هۆسرل ) بوو سڕیەوە .

هایدگـەر: بـەڵێ ئەوە راستی بوو . هۆكارەكەشم لەكتێبی (unterwegs zur sprache) . روون كـردۆتەوە : كەئــەوەی خــوارەوە تــیایدا دەبینــیەوە :" بــۆ ئــەوەی بەرپەرچی پـروپاگەندە هەڵەكان بدەمـەوە ، زۆر جـاران دوو دڵ بـووم . دەبێ ئـەوە بڵێم پێشكەش كـردنەكە لـە (وجـودو زەمـەن)دا لەچاپی چوارەمدا كەلە ساڵی ١٩٣٥دا بلاوبــوەوە لەشــوێنی خــۆی دابــوو . بــەلام كاتــێك چاپخانەكە ئـەوەی بیـنی كـە پێشـەكی كتێـبەكە تووشـی هـەندێ تـەنگو چـەڵەمە بـەڵكو رێگرتـنی دەكـات، داوای لـێكردم لای بـەم ، منـیش قـبوڵم كـرد بەمەرجـێك ئـەو تێبینـیەی كەهەبوو لەلاپەڕەی ٣٨دا بمینێتەوە . كەتیایدا هاتـبوو :" ئەگـەر ئـەو لێكۆڵیـنەوەیە چـەند هـەنگاوێك





بەرەو پێشەوە رۆیشتبێت لەبواری لێکۆڵینەوە لەخودی شتەکان ، ئەوا نوسەر سوپاسی هۆسرل دەکات کە هاوکاری کردووە لە ئامادەکردنی بابەتەکەی لەمیانەی ساڵانی خوێندن لەفرایبۆرگدا . ئەمەش بەهۆی باشی ئاراستەکردن و توانای تێبینی ئەو، بۆ ئەو کارانەی پەیوەست بوون بە فیۆمینۆلۆژیا کە هەلێکم بۆ رێك نەکەوت بلاٌوببنەوە .

شبیگل: کەواتە سودی نییە پرسیاری ئەوەت لێ بکەین ئاخۆ بەراست رێگات لەمامۆستای شەرەف هۆسرل گرت لەوەی بێتە ناو کتێبخانەی زانکۆ، کتێبخانەی کۆری فەلەسەفی کاتێك سەرۆکی زانکۆ بوویت .

هایدگەر: ئەوە دوو زمانیو ڤین لەدڵیە

شبیگل: هیچ نامەیەکیش نییە کە ئەو رێگا گرتنەی تیا بێت ؟ چۆن ئەو تۆمەتت ئاراستە کرد ؟

هایدگەر:- نازانم .. هیچ راڤەیەکیشم بۆ ئەمە نییە ، دەتوانم مەحاڵی تۆمەتێکی واتان بۆ روون بکەمەوە ، ئەویش بەئاماژەدان بەرووداوێك کە نەزانراوە . کاتێك سەرۆکی زانکۆ بووم ، وەزارەتی پەروەردە دەستی بەدوو مامۆستای یەهودی لەپۆستەکانیان کێشایەوە ، یەکەمیان ( فۆن هاوزەر)بوو کە دواتر خەلاٌتی نۆبڵی وەرگرت ، لەو کاتەدا مامۆستای پزیشکیو بەرێوبەری نەخۆشخانەی زانکۆ بوو . دووەمیان (فۆن هێفسی)بووکە مامۆستای فیزیاو کیمیا بوو ، بەلاٌم توانیم بیانگێرمەوە پۆستەکەی خۆیان بەهۆی ئەو پەیوەندیانەی کە بۆخۆم لەناو وەزارەتدا پێیان هەڵسام . ئەگەر بەو کارە هەڵبستمو لەهەمان کاتدا واش هەڵسوکەوت لەگەڵ هۆسرل بکەم کە ئەو کاتە خانە نشین بوو کەوا مامۆستام بوو ، بەو شێوە هەڵسوکەوتە ئەوا شتێکی تەواو ناماقوڵە ! دواتر من رێگام لەوخۆپیشاندانانە گرت کە هەندێك لەخوێندکارەکانو مامۆستایان دژی (فون هاوزەر) رێکیان خستبوو ، لەو کاتەدا شتێك هەبوو بەناوی privatdozeulen."مەبەست مامۆستا بێ کورسیەکانە " ئەوانەی سنوریان بەزاندبوو دەیانگوت ئەوە هەلێکە بۆ ئەوەی بچینە پێش کاتێکیش پەیوەندییان پێوە کردم دەرم کردن .

شبیگل: تۆ لەناشتنی هوسرلدا ئامادەنەبوویت .

هایدگەر: دەمەوێ ئەوە بڵێم کە ئەو تۆمەتەی دەیەوێ بڵێت من هەوڵمدا بۆ پچڕاندنی پەیوەندییەکانم بە (هۆسرل)وە هیچ بنەمایەکی راستی نییە . خێزانەکەم لەساڵی ١٩٣٣لەنامەیەکیدا بۆ خێزانی هۆسرل بەناوی ئێمە نوسیویەتیو تیایدا باس لەدانپیانانی ئێمە دەکات بۆ چاکەی ئەوان ، هاوپێچ لەگەڵ چەپکی گوڵ ئەم نامەیەم بۆ هۆسرل نارد. خێزانی هۆسرل بە شێوەیەکی کورت وەلاٌمی دایەوەو پێی راگەیاندین کە پەیوەندی نێوان هەردوو خێزانەکە کۆتایی هاتووە .

ئەگەر تۆ بێ تاقەت بووی لە گوزارشت کردنو دانپیانانم بەچاکەو ڕێــزو ستایشـم لـەکاتی نەخۆشـیو مـردنی هۆسرڵدا ، ئەوا هەڵەیەکی مرۆییە . داوای لێبوردنم لەوە کـرد لەبەرامـبەر خـێزانی هۆسـرل لەنامەیـەکدا کـە بـۆم ڕەوانە کردبوو.

شـبیگل: سـاڵی ۱۹۳۸هۆسـرل مـرد. هـەر لەفیـبرایەری ۱۹۳٤ یـش دەسـت کێشـانەوەی خـۆت لەسـەرۆکایەتی زانکـۆ پێشکەش کرد ، چۆن ئەو بڕیارەتدا ؟

هایدگـەر: لـێرەوە ئـەبێ تۆزێـك فـراوانتر بچـمە نـێو وردەکاری قسەکردن بـۆ بـەزاندنی ڕێکخستنی تەکنیکی زانکـۆ ، واتــە بـۆ نوێکـردنەوەی کۆلـێژەکان لـەناوخۆدا دەسـپێك لەکارەکانــیان لەبەرامــبەر خــودی شــتەکان. لــەوەرزی زسـتانی ۱۹۳۳-۱۹۳٤دا پێشـنیاری نـاوی ئـەو هاوڕێــیانەم کــرد کــە لــەرووی تەمەنـــەوە لـــەمن بچـووکتربوون بـۆ راگـرایەتی تـەواوی کۆلـێژەکان کـە تواناکانـیان گەورەبوو لەبواری پسپۆریەکانیاندا ، ئەمەش بـەبێ تەماشـاکردنی پەیوەندیـیان بـەم حـزبەوە . بـەم شـێوەیە ( ئـەریف فۆل) بووە راگری کۆلێژی یاسا و(شادۆ ولـدت) بـووە راگـری کۆلـێژی فەلسەفە و (سورغال) بووە راگـری کۆلـێژی زانسـت و( فـۆن مۆلۆنـدرۆف) کـە لەپۆستی سـەرۆکایەتی زانکۆ دوورخـرایەوە بووە راگری کۆلـێژی پزیشـکی . هـەر لـەکۆتایی سـاڵی ۱۹۳۳ ئـەوەم بـۆ روون بـوەوە کـە پرۆسـەی نوێکـردنەوە لـەناو زانکـۆ دا بـەلای مـنەوە شـتێکی مەحاڵە. ئـەویش بـەهۆی بەرگری پــیاوانی فــێرکردنوحزب بــۆ ئــەم شــتە هــەندێك لـــەهاوڕێکانم رەخـــنەیان لێ گـــرتم بـــەوەی هـــەندێ لەخوێـندکارانم هێـناوەتە نـێو ئەنجوومـەنی زانکـۆ ، ئەو پرسـە ئێسـتا بەشـێوەیەکی ئاسـایی روو دەدات. رۆژێکیان لـەوەزارەت بـانگ کـرام داوام لـێکرا کـە ئەو راگرانەی دام مــەزراندبوون بەهــەندێ دۆســتی تــر بــیانگۆڕم ، ئــەم پیێشنیارەم رەتکردەوە هەڕەشەی دەست لەکارکێشانەوەی خـۆم کـرد ئەگـەر بێتو وەزارەت لەسـەر ئەم شتە سوور بێت. هـەر ئـەوەش بـوو بەکردەیی روویدا . لەفیبرایەری ۱۹۳٤ دەسـتم لەکارکێشـایەوە ، ئەمـەش دوای "۱۰" مـانگ لەدەست بەکاربوونم وەك سەرۆکی زانکۆ . رۆژنامەوانانی ئـەڵمانیو بێگانە لەسەر ئەو کارە بێدەنگ بوون . کەچی هـەواڵی دامـەزراندنی مـنیان بـە شـێوەیەکی هـەرا ئامـێز راگەیاند .

شـــــبیگل: ئایــــا پەیوەندییەکانـــــت داویدەســـــت لەکارکێشـانەوەت لەسـەرۆکایەتی زانکـۆ لەگـەڵ سۆسـیال ناسیۆنالیستەکاندا گۆڕا؟

هایدگـەر: دوای دەسـت لەکارکێشـانەوەم ، تـەنها بـەکاری مامۆسـتایەتی وازم هێـنا . لـەماوەی وەزری هاویـنی ۱۹۳٤ وانەیـەکم لەسـەر لۆژیـك پێشـکەش کـرد، لـەوەزی دووەم ۱۹۳٤-۱۹۳٥ وانەیـەکم سـەبارەت بـە (هۆڵدەرلین) پێشکەش کــرد. هــەروەك لەســاڵی ۱۹۳٦دا لەوانــەکاندا دەربــارەی





نیتچە قوولّ بوومەوە . ئەوانەی کەتوانای گوێگرتنیان هەبوو لەوە تێگەیشتن کە ئەوەی لەو وانانەدا گوتم ، ئاراستەی سۆسیال ناسیۆنالیستەکان بوو .

شبیگل: چۆن پرۆسەی دامەزراندنی سەرۆکی نویٚ بەرێوە چوو ؟ لەبۆنەکەدا ئامادە بوویت ؟

هایدگەر: ئامادەبوونم لەئاهەنگی فەرمیدا رەتکردەوە .

شبیگل: ئایا سەرۆکی نویٚ ئەندامی حزب بوو ؟

هایدگەر: پیاوی یاسا بوو ، رۆژنامەی حزبیش dvAlemanneبەمانشێتێکی گەورە لەبارەی ناوهێنانی وەك سەرۆك راگەیاند: " یەکەم سەرۆکی زانکۆی سۆسیال ناسیۆنالیستیە ".

شبیگل: حزب چۆن هەلّسوکەوتی لەگەلّدا کردی ؟

هایدگەر: بەردەوام لەژێر چاودێریدا بووم .

شبیگل: زانیاریت بەرامبەر ئەوە هەبوو؟

هایدگەر: بەلّێ کێشەی دکتۆر (هانکە) )hanke.

شبیگل: چۆن تێبینی ئەوەت کرد ؟

هایدگەر: دوای ئەوەی لەوەزی زستان ١٩٣٦-١٩٣٧دا چوومە میتینگی دکتۆراکەی سەردانی کردمو لەوکۆڕە بالآیەدا بەشداری کرد کەلەماوەی هاوینی ١٩٣٧دا سەرپەریشتیم کرد . هەوالگری بۆ چاودێری کردنی منیان ناردبوو.

شبیگل: بۆچی لەناکاو هاتە سەردانت ؟

هایدگەر: بەهۆی ئەو کۆڕەی تایبەتم کردبوو بە نیتچە لەماوەی وەزری هاوینی ١٩٣٧دا، دوای زانیاری لەسەر ئەو ڕێگایەی پێی جێبەجیٚ دەکرا ، دانی بەوەدانا کە ناتوانیٚ بەکاری چاودێری کردن هەلّسیٚ ، دەیویست لەوە ئاگادارم بکاتەوە بۆ ئەوەی بتوانم ئەوە بزانم لەئایندەدا چیم بەسەردێت.

شبیگل: کەواتە حزب بەتوندی چاودێری دەکردی ؟

هایدگەر: دەمزانی کە قسەکردن دەربارەی کتێبەکانی من قەدەغەیە، بۆ نمونە ئەو لێکۆلّینەوەیەی کە پێی هەلّسام لەسەر تیۆری ئەفلآتون لەمەعریفەدا . گۆڤاری لاوە هیتلەرییەکان بەقینەوە هێرشیان کردە سەر ئەو وانە بێژیەی من دەربارەی هۆلّدرلین کەوا لەماوەی بەهاری ١٩٣دا لەپەیمانگای ئەلّمانی لە رۆمادا گوتمەوە . ئەوانەی ئەو پرسەیان لا گرنگە دەتوانن بگەرێنەوە بۆ گۆڤاری ئەریك کریاك uelkimwerdenبۆ ئەوەی ئەو هێرشە بخوێنێتەوە کە هەر لەسەرەتای هاوینی ١٩٣٤دا بەرامبەرم کرا. حکومەتی ئەلّمانی ئەوەی رەتکردەوە کە بمنێری بۆ ئامادەبوون لەکۆنگرەی جیهانی بۆ فەلەسەفە کە لە پراگ و سالّی ١٩٣٤دا بەسترا . هەروەك من لەکۆنگرەی جیهانی تایبەت بەدیکارت کەوا لە پاریس سالّی ١٩٣٧دا بەسترا ئامادە نەبووم . لێژنەی کۆنگرەی پاریس بەئامادەنەبوونی من سەریان سوڕما ، بۆیە لەرێگای مامۆستا (بریهایی )کە مامۆستای فەلسەفە بوو لەزانکۆی سۆربۆن بەداوایاندا ناردم بۆئەوەی ئەو پرسە روون بکەمەوە ، بۆ تێگەیشتن لەو هۆیانەی کەوایان لێکردم کە

لەناو شاندی ئەڵمانیدا نەبم . لەوەلأمدا داوام لەلیژنەی کۆنگرەکە کرد کە ئەم پرسە لەلای وەزارەتی پەروەدەوە لەرایخدا روون بکەنەوە . دوای ئەمە داوەتنامەیەکم لەبەرلین پێگەیشت کە داوام لێدەکات پەیوەندی بەشاندەکەوە بکەم ، رەتم کردەوە . دەقی هەردوو وانە بێژیەکانم (میتافیزیکا چییە ؟)و (جەوهەری حەقیقەت ) م ، بەنهێنیو بەبێ بەرگ فرۆشتن. ئەو وتارەی کە لەکاتی دامەزراندنمدا وەك سەرۆکی زانکۆ پێشکەشم کرد بەفەرمانی حزب دوای ساڵی ١٩٣٤ کۆکرایەوە .

شبیگل: کەواتە دوای ئەمە بارودۆخەکان شلەژان ؟

هایدگەر: لەدوا ساڵی شەڕدا (٥٠٠) کەس لەگرنگترین زانایانو هونەرمەندان لەخزمەتی شەڕ بەخشران . بەلأم من لەگەڵدا نەبووم . بەپێچەوانەوە بانگ کرام بۆئەوەی بە کاری قایمکردنی سەر رووباری راین هەڵسم .

شبیگل: کارل بارت karlbarthیش لەبەرەکەی تر کەبەری سویسرایە بەو کارە هەڵدەستا .

هایدگەر: ئەو رێگەیەی کە بەهۆیەوە رووداوەکان روویاندا زۆر گرنگ بوون سەرۆکی زانکۆو هەموو دەزگای فێرکردنی بانگ کرد ، وتارێکی کورتیخوێندەوە کە ئەمە ناوەرۆکەکەی بوو : ئەو رێوشوێنانە گیرانە بەر لەلایەن دەزگای بالأو حزبی سۆسیال ناسیۆنالیستەوە رەزامەندی لەسەر کراوە . ئەویش ئەوەیە دەزگای فێرکردن دەکاتە سێ گروە یەکەمیان ئەو گروهەی ناکرێ دەستبەرداری بین ، دووەمیان ئەو گروهەی دەکرێو ناکرێ دەستبەرداریان بین ، سێیەمیان ئەو گروهەی کەدەکرێ بەتەواوەتی دەستبەرداریان بین . لەسەرووی ئەو لیستەشدا کەدەکرا دەستبەرداریان بن (هایدگەرو ریتار) بوون . لەماوەی وەزری ١٩٤٤-١٩٤٥ دوای کۆتایی هاتنی کاری قایمکردن لەسەر رووباری "راین" وانەیەکم بەناوی (شیعرو فیکر Dichteu und denken) پێشکەش کرد، کەوا تەواوکەری وانەکەم بوو دەربارەی نیتچە ، واتە روون کردنەوەی هەڵوێستم بوو لە سۆسیال ناسیۆنالیستەکان. دوای ماوەی دووەم لەمیلیشای گەلێری کرامە سەرباز Volksstunm کە تیایدا بەتەمەنترین کەس بووم لە نێوان سەربازەکانی دەزگای زانستیدا .







یۆرگن هابرماس



# چۆن لەگەڵ هایدگەردا دژی هایدگەر بیربکەینەوە؟

یورگن هابرماس

لێرەوە مارتن هایدگەرمان وەك فەیلەسوفێك لاگرنگ نییە، بەڵکو ئەوەی سەرقاڵمان دەکا، تیشکدانەوە سیاسیەکەیەتی، هەروەك کاریگەرییەکەشی لەسەر بۆچوونەکانی نێوەندی زانکۆیی نا، بەڵکوئاستی پێکهاتو قورسایی ئیرادەی ئەو خوێندکارانەی کەجێگەی گەشانەوەو سەرهەڵدانی حەماسەت بوون.

ئەستەمە بلیمەتی بوون بەبێ گیروگاز بێتەکایەوە، لەوانەشە هیگل لەسەر راست بووبێ کە بیری لەوەکردەوە ، ئەو تاکانەی مێژوویەکی گەردوونیانەیان تیا خولقاوە، ناکرێ لەسەر بنەماو پێوانەی ئەخلاقیانە(مۆراڵیانە) حوکمیان بەسەردا بدەین.وەلێ

کاتێ ئەو گرفتە هاوکار دەبێت بۆ تێگەیشتن لە بلیمەتیی، یان بەگوتەیەکی راستتر سەرچاوەی مەعریفە پێدانیەتی، لێرەوە هاوکات ئەوەی دواییان دەبێتە هۆی تێکدانی سیاسیانە، بەئاگایی بوونی رەخنەگرتنیش لای خەڵك(گەل) لەو حاڵەتەدا شەرعیەتی خۆی بەدەست دەهێنێتەوە. بەڵام ئەو رەخنەیە ناکرێ حوکم بەسەر شتێکدا بدات کە لەتوانای نەبووە هەستی پێبکات، وەك رووداوەکانی تایبەت بەژیانی کەسەکە، کەئامادەکاری و پێکهێنەری بۆبڕیارەکانی تاك دەکات.

هەقی ئەو رەخنەیەیە بەسانایی تەفسیرێك بداتە ئەو بارودۆخەیکە زەمینە خۆشکەری بووە، بۆ بەدەرکەوتنی ئاژاوەو تەنگەژە مەردوومییەکان، بەو مانایەی ئەو بارو دۆخەی کە لەئاییندەدا،بێ شك دەبێ، بۆ لۆژیکی رێگرتن لە رووداوی لەو جۆرە بگۆڕێت.

هەر لەساڵی ١٩٤٥ یشەوەو، لەچەندین رووی جیاوە، مەسەلەی هایدگەرو فاشیەت خرایەروو. لەو جەدەلەشدا جەخت لەسەر ئەو گوتارەی هایدگەر دەکرایەوە کە لەساڵی ١٩٣٣ و لەکاتی دامەزرانی بەراگری زانکۆی(فرایبورگ) پێشکەشی کردبوو، تیایدا باسی لە (گۆڕانکارییەکی قوڵ لەوجودی ئەڵمانیادا)کردبوو، لێرەشەوە ئەگەر رەخنەمان لەو ئاستە بوەستێتەوە ،ئەوا بەسادەیی دەمێنێتەوە. بەپێچەوانەوە، گرنگ و سەرکەوتووشە کە بزانین دانەری "وجود و زەمەن"(کەوا گرنگترین رووداوی فەلسەفییە لە فینۆمینۆلۆژیای هیگڵەوە) چۆن رێگای بە خۆیدا بۆدابەزینە ئەو ئاستەی فیکری سەرەتایی، کە بۆخاوەن روانگەیەکی نەخشارو رێك وپێك لەساتی یەکەمەوە، تەنهاو تەنها قسەیەکی گەورەکراوو بێجوانپۆشی بوو لەشێوازدا.

مەبەستم لە مەیان گوتاری هایدگەرە لەمەڕ بڕیاردانی زانکۆی ئەڵمانیالەسەر چارەنووسی خۆی. مەسەلەی ئەنتلێنجنسیای فاشیەت کەوا لەو شێوە بارودۆخەدا دەخرێتەروو، لەوە دەچێ جەختکردن و توندوتیژتر بێت، کاتێك لەرێگای بیرکردنەوەماندا ئەوە دەرنجام دەکەین، کەوا ناکرێ ئەنتلێنجنسیای فاشیەت تەنها بۆ هۆکارێکی سادە هاتبێتە ئاراوە، ئەویش ئەوەیە کە رووکەشی کۆمەڵە موڵکدارێك و فەرمانبەرانێکی بەکاربراو لە چوارچێوەی نازیەتدا ئەو خستنەرووەیان قەبوڵنەکرد کە رۆشنبیران پێشکەشیان کردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بیرمەندانەی کەوا عەقڵیەت و بابەتە هەموار کراوەکانیان گونجاوو تەبا بوون لەگەڵ تەماهیەکانی فاشیەت، ئامادەگییان هەبوو. پێویستناکات لێرەوە هیچ ناوێك بەرین، چونکە ئەم مەسەلەیە بەرەو لەیەکنەگەیشتنمان دەبات.

هێزەکان ئامادەگیان هەبوو، تەنها بەرتەسکی روانینی فەرمانبەرەکانی چوارچێوەی نازیەتبوون کە سەرکردایەتی ئەو هێزانەیان دەکرد بۆ ئۆپۆزسیۆنی، بەشێوەیەك کەوا(بزاڤە)کە لەپرۆسەی سەرنگۆمکردن و لەناوبردنی ئەوانەی کە هەڵگری بەرپرسیارێتی کەلتووری رۆشنبیری بوون، توانی بەشێوەیەکی تەواو ئاشکرا بەدەربکەوێت لەلایەکی دیکە"سۆسیالیزمی نەتەوەیی" شتێك نەبوو جگە لەپاشماوەیەکی روخاوی بەسەرچوو کە لەنێو رەوتەگەورەکانی ئەو سەردەمەدا بێ بنەماوفشۆڵبوو، هەروەها نامۆ بوو لەناو کۆمەڵگای ئەڵمانیاداو لەدەرەوەڕا زێدەیکرابووە سەر. بێگومان لەبەردەم ئەو مەسەلەیەشدا ، هیچ کاردانەوەیەکی زەرووری‌و کۆتایی هێنەر لەتەقلیدی (باوی) ئەڵمانی بەرهەم نەهات.

لەگەڵ ئەوەشدا نابێ ئەوە بەرهەم بێنین کە هەڵەیەو ، سەرنزشتی ئەو هەولانەش بکەین کە بەهەمان ئاراستەی رۆمانی"تۆماس مان"( دکتۆر فاوست)دا رۆیشتن و هەوڵیدا لەناو کلاسیکیەتی رۆشنبیری ئەڵمانیدا لەرەچەڵەکی نازیەت بکۆڵێتەوە، بۆئەوەی ئەو دژەبەرایەتی‌و ململانێیە ئاشکرا بکات کەلەقۆناغەکانی داڕمانیاندا بەرەو فاشیەت دەچن. مەسەلەی ئەنتێلێنجنسیای نازیەتیش وەك مەسەلەیەکی بەر لە مێژووی نازیەت روون دەبێتەوە، هەر لەساڵی ١٩٤٥ەوە بارودۆخ لەئەڵمانیادا بەرەگەزێکی بنەڕەتی جیادەکرێتەوە کە خۆڵێلادانی خستنەرووی بابەتێکی لەو جۆرە لەئارا بوو، هەروەها دەربارەی ئەو دووخاڵە:١) شەرعیەتی خستنەرووی ئەم ئۆبژێکتیڤە ٢)مەسەلەی خۆدزینەوەو هەڵاتن لێی. بۆ ئەمەش بەڵگەیەکی ئەدەبی زۆر گرنگمان هەیە..ئەویش کتێبی هایدگەرە بەناوی(سەرەتایەك بۆ میتافیزیکا) کەوا کۆمەڵە دەقێکەو لەساڵی ١٩٣٥ دا نوسیوویەتی. هەروەك لە پێشەکیەکەیدا دەریدەخات، ئەو کۆمەڵە تێبینیانەی کەزێدەکراوەنەتە نێو کەوانەکان لەهەمان کات و سەردەمدا نووسراون.

لەرۆژنامەی ٢٠٢دا هایدگەر باس لە(سۆسیال ناسیۆنالیستی)وهەروەها"بالایی ئەو بزاڤەو راستیە نێوخۆییەکان"دەکات (مەبەستی‌لەبەیەگشتنی نێوان تەکنیکی بەدەستهاتوو لەسەر ئاستی گەردوون و لەنێوان مرۆڤی مۆدێرن)ە. کاتێکیش تێبینی دەکەین کرۆکی ئەو بیرۆکانە لەساڵی١٩٥٣ بۆیەکەمجار بەبێ هیچ قسە لەسەرکردنێك دەرکەوتن.

لێرەوە لەتواناماندا هەیە ئەوە وێنابکەین کەوا گواستنەوەیەکی بەئەمانەتەوەیە لەو رەهەندەی هایدگەر بیری لێدەکاتەوە. هەروەك زۆر پێویست نییە گەواهییەك بۆ بالایی سۆسیالیزمی نەتەوەیی‌و راستیە نێو خۆییەکانی بدەین، ئەگەر بهاتباو ئەنجامگیری





ناوەڕۆکی ئەو لێکچەرانەی کە لەو ماوەیەدا گوترانەوە نەبان.هایدگەر بەئاشکرا بەرووبەرووبوونەوەی پرسیاری سەرجەم پرسیارەکان هەڵدەستێ، پریساری وجود و پەیوەندی بە بزاڤی مێژوویی لەو ماوەیەدا.

ئەوەش زانراوە کە(ئێستا) بە نیسبەت هایدگەر مەحکومە بە چارەنووسی لەبیرکردنی وجود. بێشك گەلان لەمیانەی مەشغەڵەت و بەرهەمهێنانی پەیوەندییەکی دیاریکراو لەگەڵ شتەکان هەڵدەسەنگێنرێن، وەلێ لەئەمەدێکی دوورەوەو، لەئەوجی وجودەوە هاتۆتە خوارەوە. لەبەرئەوە، ئەگەر ئێمە لەروانگەی میتافیزیکیانە قسەمانکرد، دەتوانین بڵێین ساتمە دەگرین، ئەو گێژاوەش بەئاشکرا لەمیانەی دیاردەکانی تەکنیکارییەوە دووپات دەبنەوە، وەلێ لەراستیدا ئەو تەکنیکارییە بەیەك شێوەو نەسق لەهەموو شوێنێکدا گەشەی‌نەکردووە. بۆنموونە ئەوروپا لە نێوان بەرداشی روسیاو ئەمریکای لاتیندایە، کەلەجەوهەردا لێك دەکەن ئەوان:"ئەو شێتیە کۆتاییە نیین بۆشاڵاوبردن و تەکنیکاریی و هەڵچوونە توندوتیژەکان، ئەوەش ئامادەکردنێکی شێواوە بۆ ئەو مرۆڤانەی بوونەتە ژێرباری یاساو رێساکان"کە بەنیسبەت ئەوان زەمەن جگە لەخێرایی مانای شتێکی‌تر ناگەیێنێ.



٢

لەدوو رووەوە هەڵاتنی خوداوەند ،تاریکستانی دونیاو گەندەڵی زەمین، دەستەمۆکردنی مرۆڤ وگلبوونەوەی رق وکینە، گومان لەهەموو شتێك کەئازادو خولقێنەر بێت لەئەوروپادا بڵاودەبێتەوە. لەبەر ئەمەش لەئایندەدا چارەنووسی گەردوون لەئەوروپاوە بڕیاری لەمەڕ دەدرێ، بەدەسنیشانکردن لە ناوجەرگەی ئەوگەلەی‌لە(ناوەند)دا دەژێت و زیاترلەهەر گەلێکی تر تووشی (فشاری توندترین بەرداش دەبێتەوە):" ئەو گەلەی کە زۆرترین دەرودراوسێی هەبن، لە ئەنجامدا ئەو گەلەیە کە زیاتر بەرەنگاری ترسناکی دەبێتەوە، بەمانایەکی دی ئەو گەلانە گەلی میتافیزیکین".بەڵام لەمیانەی ئەو دژە مەیلەی هەیەتی گەل ناتوانێ چارەنووسێکی باڵا بۆخۆی بونیاد بنێ، تەنها ئەگەر توانای ئەوەی هەبێ بەرێگەیەکی خولقێنەرانە خاوەنی ئاکار و کەلتووری تایبەتی خۆی بێت.بائەمەش روونکەینەوە:بەهۆی‌حاڵەتێکی سیاسیی لەساڵی ١٩٣٥دا کەوا بەهۆیەوە ململانێ لەدوو لایەندا سەرچاوە دەگرێتو، بەم مانایەی لەیەك کاتداو بەیەکەوە دژی رۆژئاواو دژی رۆژهەڵات بێت. هایدگەر ئەو رەونەقی قۆناغە دەبینێ بۆ وجود ، کەماوەیەکی زەمەنی ،

مەزنەکـراوەو زیاتـر لەهەزارسـاڵ زەمیـنە خۆشـکەری بـووە، ئـەو جـۆرە قۆناغــەش ئەرکـێکی دیاریکــراوی لەمـێژووی گـەردووندا خسـتە ئەسـتۆی گـەلی ئـەڵمانی، بۆئـەوەی لەوشـێوازەش بگـەین کە لە لێکچەرەکاندا خۆی نوانـد وئەو هێزی تیشکدانەوەو دەینونەیەش کە لێیەوە هەڵقوڵاوە. لـێرەوە واپێویسـتە ئـەو جەدەلیەتە بەدەست بێـنین کـە هایدگـەر لەرێگایــەوە قسـە بـۆ گوێگـرەکانی لەسـاڵی ١٩٣٥ و خوێـنەرانی لەسـاڵی١٩٥٣دا دەکـات. ئـەو بانگەشـەی دەکـردن بـۆ بـوون و وجودێکی قارەمانانە دژ بــەرووخان و خـــراپی رۆژانـــەیی و هەمەرەنگیـــیە تایـبەتەکانی ئـەو داواکـردنەن کـە دەکـرێ لەسـێ دیـاردە بەدەربخرێت.

(هـێز) ئــەو توانایەیــە کــە تــاکی ئەرسـتۆکرات دەگەیەنێـتە ئاسـتی بەرزتـر لەشـێوە زبـرەکەی ئاسـتی گشــتی. ئـــەو ئەرســتۆکراتیەی کـــەوا ســـەروەریەکەی دیاریدەکـات بـەرز دەبێـتەوە بـۆ ئاسـتی خانـەوادەکان‌و پایـــەو دەســـەڵاتەکەی کـــە بـــە تایبەتمەندیـــیەکانی بوونی‌خۆیـــان دەبیـــنێ، لـــەو رێگەیـــەوە بەدەســـتیان دەهێـنێ.بـەڵام خەڵکـە عەوامەکـە "وەك بـارە بـەرن" ئەمـەش ئـەو دەسـتەواژەیەی (هیرۆکلیس)ە کـە هایدگەر لـێی خواستووەو لەسەری رازی‌بووە، ئەمانەش شتێك نین جگـە لـە کۆمەڵە کەرو سەگێك."راستەقینەیی بۆ هەموو

خـــــەڵك نیـــــیە، تـــــەنها بـــــۆ بەهـــــێزو باڵادەستەکانە"(هیرۆکلیس).

لـەدوای ئەمـە فـیکر(dergist ) ئـەو شـتەیە کـە بیرمـــەند(der deker) لەرۆشـــنبیر جـــیادەکاتەوە مەسـەلەی ژیـریش ئاراسـتەیە بـۆ ئـەو شـتانەی کـەوایان لـێدەکات ئامادەباشـبن بۆئەو بەکارهێنان یان ئەمیان بەو شـێوە دەستگرتنەشـی کـە شـتەکان راسـت دەکاتـەوە، ئەمـەیان دەچـێتە هـەمان ئاسـت.. ژمـارەو فراوانـیەکەی دوو رەهـەندی گـرنگن و (لـێهاتوویی)ش ئـەو مانایە نییە بەنیسـبەت ئـەو فـیکرەیەی کـە لـە زێدەبوونـی سـامان سەرچاوەی گرتووە.

ئـەو (بـیر)ەش کـە شـوێنکەوتەی کاریگـەری یاساکانی لۆژیکـــی کلاســـیکین، دەستەوەســـتانن لەهەســـتکردن بەمەسـەلەی وجـود و خسـتنەرووی هـەر مەسـەلەیەکی دی.. خوێـندکاران ئـەوە فـێر دەبـن کـە بیرکـردنەوەو تێبیـــنی و پـــێوانە شـــتی دراون و مەســـەلەکە تـــەنها پەیوەسـتە بـە بەهـرەو مەشـقکردن، دابەشـکردن بەسـەر ئاسـتی سـەراپاییدا.رووکەشی و قوڵایی، لەمادده بەتاڵن و دەوڵەمەندیشـن پـێی، هەڵچون و خولقـاندن، ئەو وەسفە دژانەن کە هەریەك لەژیری و فیکر تایبەتمەندە پێیەوە. هایدگـەر بەهێزو توانایەکی توند داکۆکی لەفیکر دەکا دژ بەهـەر گوتەیـەکی زێدەرۆیـی کـە لەمـەڕی بکرێ. لێرەوە ئەمـەیان فـیکر نـیە، بـەڵکو تـەنها ژیرییـە، ئەمەیـە کـە





هایدگەر تیلە نیگاکەی لەوێوە ئاراستەی نەژادە رەسمیەکانی نازیەت دەکات (زانستی باشکردنینەسل یان نەژاد).

ئەوەیەکە دەبێ بخرێتە بەرتواناکانی جەستەیەکی تەندروست و ئاکاری، ئەوەیەکە هەڵوەشانەوە، بەردەوام فیکر دادەبەزێنێتە ئاستی ژیریەکی سادەو بێگەردیەکەشی ناکرێ تێبپەرێندرێ، تەنها بەو فیکرە نەبێت کە زیاتر رەگەکانی بۆ رەسەنێتی دەگەرێنەوە.

دوایین جار(بوێری) دەخرێتەسەر هێزی فیکر، بوێریێکی زۆر نادیار،کە لەتوندوتیژیوهەڵە نەترسێت، دیار، پاشقۆلگرتنو وەهم، گومڕایی هەموویان ئەو هێزانەن کە سەرچاوەکەیان وجود خۆیەتی. بەتەنها عەقڵی رۆژانە هەست بەهێزە سیحرییەکەی ناکات و دەیشێوێنێ و تووشی لادانی دەکات، تائەو کاتەی تەنها بۆ هەڵەیەکی سادەی دەگۆڕێت.

فیکری بوێر سەرلەنوێ پێکهێنانی ژیانمان لەناو مێژووی وجوددا بەشێوەیەك دەگێرێتەوە، بەتەواوەتی وەك ئەوەیە کە لەسەردەمی گریکیو پێش ئافلاتوون پێکهاتبوو. ئەمەش بۆ ئەوەی بڵێت بەڵێ بۆهەموو سەرەتایەکی راستەقینەیی کەخۆی دەربخات، تائەوکاتەی لەخەتەرو سەرەرۆیی کردندا دەژێت:ئەوەیان کە بەتوندوتیژی هەڵدەسێت و ئەوەشیان کەوا ئەو خالیقەیە بەسەر کائینەکەدا زاڵ دەبێتو ئەمەیان بەو مانایەی کە لەگوتارەکەیدا بەرەو ئاراستەیەکی نادیار رێگا دەبڕێت لەوێشەوە بۆروانینێکی شاراوەو دیداریانەو ئەوکردارەشی کە هێشتا جێبەجێی نەکردوو بۆچی!.

لێرەوە توندوتیژی ئەو مانا رووکەشیەی نییە کە (دەمارگیریەکی حەقیقیو سەرەتایی بێت)، بەڵکو بەتەواوەتی پێچەوانەی ئەمەیانە. مرۆڤی ترساو ، تەماحکار بۆ رێککەوتنو پێکهاتنەوە، بۆهاوکاری و بەهاناهاتن، ئەو مرۆڤەیەکە توندو تیژی بەشتێکی تێکدەر دەبینێت لەژیانیداو لێیبێزارە."لەبەرئەم هۆیەش ئەنجامدەری توندوتیژی راستەقینەیی لە خۆشنوودی و رێککەوتن و ئارامی ناگات. هەموئەو دیاردانە رەتدەکاتەوە ئەگەر بەرەو(سەرکەوتن یان دەسەڵاتیشی)ببەن. رقی لەرووکاری تەواوێتیو داهێنانەو بەرووبەروو بوونەوەکانی هەمی خەڵك سەرقاڵ دەکات و ئەنجامدەری توندو تیژیش، پرۆژەی بیرمەندیی و بونیادێکی دانراوو ، دروستکراوی کاری پرۆژەکە بەرزدەکاتەوە.ئەو دادەنرێتەسەر هەمووان، ترسناکێتیش لەتەنیاییەکەیدایە ،دواجار ئەو کەسە بێ هیچ دەروازەیەك دەمێنێتەوە."نەبوون"بەنیسبەت ئەم کەسە شتێکی ناولێنراوەو سەرکەوتنە بەسەر وجوددا.ئەو وایدەبینێت کە ژیان بەرێگایەکی تراژیدیانە دەگاتە پلەی کامڵ بوون و"لەکاتی رازیبوونیش، توندوتیژترین گێلی هەیەو زیاترین کرانەوەش لەسەر

وێرانکردنیدا"یە. بۆیە ئەو بۆرە مرۆڤە بەهۆی ئەو ئیرادانەیەوە بەردەوام هەموو هاوکارییەك رەتدەکاتەوە.

ئەوپرسیارەی لەسەر ئەو دەرسەی هایدگەر دەیخەینەروو، خۆی لەو تەوەرەدا دەبینێتەوە کە بانگەشەی بۆدەکا،و داوا دەکاو ئەوەیشیان کەدژی دەوەستێتەوە. ئێمە بێماندووبوون و دەستپێك بەئەزموونی (هۆلدەرلین و نیچە) ئەو گوتارە وروژێنەرانەی سالانی بیستەکان و لەو باوەڕە شازەشەوە تێی دەگەین کە ئەرکێکی تابیەت و نەتەوییە، هایدگەر بەرۆڵە بەهێز و دیاریکراوەکان دژ بەبۆرژوازییەکان هەڵساوە ، هەروەها بەرۆڵی فیکری رەسەن دژ بەهەستی هاوبەش،و، رۆڵی مردنی ئاسایی دژ بە ترساو لەسەرەرۆیی. ئەمەش دەمانگەیەنێتە ئەوەی کە بڵێین ئەو جۆرە مرۆڤانە بێگومان دەبوایە لەو بارودۆخەی سەدەی بیستەمدا رۆڵی سەرکردەیەك لەسەر ئاستی ئایدیۆلۆژی بگێرن، هەروەك رۆڵی نێرەرێکیش لەو فەزا گرگرتووەی کە ساڵی ١٩٣٥ی پێ لەساڵانیتر جیا دەکرێتەوە.

رێگاکەمان بۆ چارەسەری ئەم مەسەلەیە ئۆبژێکتیڤانە نییە، چونکە بەئاراستەی لۆژیکی هایدگەر لەو سەردەمەدا ئاراستە نەکراوە، بەڵکو بەئاراستەی ئەو شێوازەیە کە تیایدا بەرجەستەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا شەرعیەتی خۆی هەیەو، شەرعیەتەکەشی لەبوونی کرداریك وەردەگری بۆ پێکهێنانی ئیرادەیەکی وا کە کاریگەری کۆتایی هێنەری لەسەر ئاستی سیاسیانە هەبێ. ئەو شێوازەی کە لەو دەقەشدا بەرجەستە دەبێ راستەوخۆ لێیەوە دەچێتە ناو بابەتەکەوە، کەشوێنی درمەکانەو شێوازەکەشی شوێنێکی ژیندارەولێیەوە پێکهاتەی عەفەویانەی ئاکار سەرچاوە دەگرێتو بەردەوام سەرچاوەی نوێی پاڵنەرەکانی ژیانە. ئەمەشیانە کە هەموو جارێك بانگەشەکە سەرقاڵ دەکاتو تایبەتە بە پەیوەندیەکی هوشیارانە بۆ مێژوو_ کە فەلسەفەی هایدگەرە_ دەڵی گوتار دەگۆرێت،وەلێ پارێزگاری لەبونیاد دەکات بەمانا فەلسەفییەکەی پارێزگاری لەسەر جێگیری‌و سەقامگیرییەکەی دەکات لەمیانەی ئەو ماوە زەمەنییانەی کە لەرێگایانەوە گەشەی کردووە.لێرەوە بواری بەدەرخستنی بەردەوامی وتەزا سەرەکیەکانی(وجود و زەمەن) و(پەیامێك دەربارەی مرۆگەرایی)نییە، بەڵکو لەبەرامبەردا خۆی بۆخۆی سروشتی هەڵگەراوەیی جۆری گوتارەکە دەسەپێنێ.(..)

شێوازی گوتاری گۆڕان لانی کەم دووجار بەپەیوەستیشی لەگەڵ بارودۆخی سیاسیدا دەگۆڕێت. لەهەمانکاتدا بابەتە رۆشنبیرییەکەو،ئەو بابەتەشی کە شوێن جەدەل بوو دژ بەدارمان‌و شیبوونەوە، نەگۆڕان‌و رەنگرێژییەکەی فاشییەتیش لەو ماوەیەدا ئاشکرا دەبێ‌و

بەدڕندەییەکی زۆر لە لێکچەرەکانی ساڵی ١٩٣٥یدا دەردەکەوێت، بەڵام _ ئەو رەنگرێژییە تەنها لەسەر ئاستی دەرهاویشتە دەرەکییەکان بەرهەم ناهێنرێ، بەڵکو بەسەر دەرهاویشتە پەیوەندیدارەکان بەخودی لۆژیکیشەوە دەردەکەون، بۆیە لێرەدا ئەمەیە بابەتی پرسیارکردن.

هاوئاست بۆ چەمکی مێژووی(وجود) کەوا چەمێکی هایدگەرییە، بیرچوونەوەی(وجود) بەرێگایەکیزێدەتر درێژدەکاتەوەو کوناودەری هەموو فەلسەفەی رۆژئاوا لە ئەفلاتوونەوە تانیچە دەکات. سێ سەرەتا لەو پێشکەوتنە دەردەکەون. ١) گواستنەوەی فیکری"پێش سوکرات"بۆ فیکری (ئافلاتوون و ئەرستۆتالیسی)، ٢) گواستنەوەی فیکری"گریکی" بۆفیکری"لاتینی/رۆمانی"، ٣) دواجار گواستنەوەی فیکری (سەدەکانی ناوەڕاست) بۆفیکری "مۆدێرن".

هایدگەر لەپرسیارەکانی قۆڵبوتەوەو رەسەنایەتی بالآکردووە، ئەوەی کە ئاشکراشی دەکا زۆر سەرسورهێنەرە. لەگەڵ ئەمەشدا تێگەیشتنەکانی لەگشتدا بەشین،ئەو شێوە بەشییەش لەکەمو کورتیە چەندبارەکانەوە سەرهەڵدەدەن.

هایدگەر وەك پێودانگێك ئەو لایەنەی خوارەوە وەرناگرێ کە: گیروگازی تایبەت بەهیچ شێوەیەك جیانییە، بەڵکو لەچوارچێوەی فیکری ئەڵمانی بەدەرکەوتووەو دەمانگێرێتەوە بۆ شیلینگ،هۆلدەرلێن، هیگل و بومە(bohme) . لەسەرووی ئەمەشەوە هایدگەر ئارەزوومەندی، خۆلادان لەخاڵی دەسپێکی لاهوتیانە بوو، کە لەبنەرەتدا خاڵی دەسپێکردنی خۆی بوو، هەروەها دەیویست خۆی لەوە لابدات کە ژیان لە مێژووداو لەکتێبی(وجود وزەمەن) بەشێك یان پانتاییەکی سەرەکی لە ئەزموونی مەسیحگەری دیاریدەکات، کە بەرەچەڵەك ئەم مەسەلەیە بۆ قەشە ئۆگستین(augustinus) دەگەرێتەوەو پێش ئەویش بەلای (بیکرك گارد)دا تێپەریووە.ئەگەر خۆلێلادان لەو دوو رەگەزە سەرەکیەش بێتە ئاراوە، بەهەرحاڵ ، لەچوارچێوەی بابەتەکەماندا کە دەمانەوێ چارەسەری بکەین زۆر گرنگ نییە.

کاتێکیش ئەو مەسیحیەتە ناگەرێتەوە کە لەگەڵیدا بیرۆکەی بوونی دوو جیهانی جیاواز سەرهەڵدەداو، خۆی تەنها لە قۆناغێکی سادەو لەسەیرورەی هەڵوەشانەوەی رۆژئاواو داڕمانیدا بینییەوە. لێرەوە بیرۆکەی یەکسانی مرۆڤەکان لەبەردەم (خودا)دا _ئەو فیکرەیەی کە تائێستاش بنەمایەکە بەنیسبەت هیگل_ فیکرەیئازادی هەرکەسێك، نەبووە هۆی بەدەستهێنانی هاوسەنگیەکی سەرکەوتوو، ناهاوسەنگی تاکانە لەبەردەم ئیمتیازی سروشتیانەی بەهێزەکاندا، ناهاوسەنگی کەونی لەبەرنگاربوونەوەی گەلی ئەڵمانیای دیاریکراو لەمێژوودا.

لەو شوێنی دووەمـەدا، ئەگـەر ئـەوە نـەزانین کە دێکارت داوای دەکات.هەروەها هاوسەنگیەکانی لە میتۆدی فیکری کەلەســەر حیســابێك دامــەزراوەو هــەموو شــتێکی بەرجەســتەکراوی بـۆ ئــەم بەکارهێــنان و ئــەویان ژێرباکردووە، ئەگـەر هەر هەڵوێستێکی دیکەشی هەبێت، هەڵوێستی وێناکردنی خۆشباوەڕیانەو سەرەتاییە، ئەوە هەڵوەستەیێکە لەبەرامـبەر تێگەیشتنی مانـادا ئەوەستێ، ئـەوا ئـێمە گرنگی پێنادەین، لەبەر نـەرمی جەدەلیەتی بزاڤی فیکرەکان لەسەردەمی مۆدێرندا.

ئـەم جـۆرە جەدەلـەش ڕێگا لـەو فیکرە دەگرێت کە ئارەزوومــەندە بــۆ هەژموونگــەری خــۆی لــەڕێگای ڕونکـردنەوەو ، شـەرعیەتی خولقێنـەری، پاراستن لەوەی کــە وەك رای خــەڵك بێــت، لــێرەوە رەگــەزی ریفۆرمیانە،شتێکی کەمە بۆعەقڵانیەتی پراکتیکی . گەر سۆزە دژە مەسیحیەکانو دژە رۆژئاواییەکانیش وەرگرین، لەوانەیـە بەسـبن بـۆ تـێرکردنی ورێـنە ناعەقڵانـیـیەکان. ئەمـەیان ئەوەیـە کـە هایدگـەر حـەزی پـێ نەدەکـرد ، لەهـەمان کـاتدا ئـەوەی زێـدە دەکرێـتە سـەر هایدگـەر وەهمـێکی سادەو ،خۆی لەوەدەبینێتەوە کە ئەوراپانەی بـۆ نـزیك کـردنەوەو بەیەکگەیشـتنی نـێوان تەکنـیکی دیاریکـراو لەسـەر ئاستی کەونی و نێوان مرۆڤی مۆدێرن، سەرکێشـیان بکـاتو لـە سـاڵی ١٩٣٥ خسـتوونیەتیەروو، لەبارودۆخی ئـەو کـاتدا کـە زۆر بـەرووونی ماوەیەك بوو، تەکنەلۆژیا هـەژموونی کـردبووە سـەرو، ئەمەش بوو کە دەبووایــە بەشــێوەیەکی ســاکاری ببێــتە هــۆی هەڵــە تێنەگەیشتن، بەپشتبەستن بەمـەش بـۆ قەڵپبوونی ئەو ئەنجامــەی کــە هایدگــەر چــاوی‌لێبوو، کەوێرانکــردنی تەکنیك و تەکنەلۆژیا و ملپێکەچکردنی بوو بۆ ئیرادەی مـرۆڤ. ئـاخۆ سـووربوون بەوگوتارەیـەوە دیـار نـەبوو بـۆ خوێـندکارەکان کـە فەلسەفەکەی لەخۆگرتـبوو، ، سەرەتا کۆك و هاوتـەبابوو لەگـەڵ ئەوانەی وەك ئەفسەر ئەمری جێبەجێکردنیان دەدا؟

بێگومانـیش مەسـەلەکە لـەوەدا نیـیە کـە هـاندان بێـت، بـەڵکو هایدگـەر خـۆی، کـە بۆچـەندین سـاڵ تەسـلیم بەتەماحیـێدانەکان بـبوو، هەر ئەویش ڕێگامان پێدەدات، بۆگومانکـردن لـەو شێوە کۆکی و ڕێکییە. لەکۆتاییدا دوو پرسیار بەهەلواسراوی دەمێننەوە: ئەو هاوکۆکییە ئەگەر وەهمـیش بێـت پشـتی بـە چ شـتێك بەسـتبوو؟ ئـاخۆ نازیـەت هـیچ پەیوەندیـیەکی تونـدو تۆڵی بەکەلـتووری تەقلیدی فیکری ئەڵمانییەوە هەبوو، زێترلەوەی کە ئێمە وێنای دەکەین؟

دووەمـیان : ئـەو هۆیەچییە کـەوا لەهایدگـەر دەکـا وانـەکانی لـە سـاڵی ١٩٥٣ بڵاوبکاتـەوەی بێـئەوەی هـیچ مەودایــەك لەنــێوان خــۆی و ئــەودا بێڵێــتەوە؟ئەم هەڵوێستـەش لەگـەل پرەنسیپەکان کـۆك نیـیە، تـاوەکو رابــردوو لــە چــێوەی لێکۆڵیــنەوەکەدا بەشــێوەیەکی





بەردەوام نەخرێتەروو.زیاتریش لەمە، هەڵوێستەکە دەبێتە بەندی دووبارەبوونەوەیەکی سادەو، لەگەڵ ئامانج و پرەنسیپەکان کۆك نابێ، تەنها لەروانگەی ئەو رایە نەبێ کە لە تیلەنیگای مێژوو(وجود)دا شاراوەو، بێ دابینکردنی تەفسیرێکی مۆراڵیانە(هەڵەیە) بەوەی کە لەوانەیە"نازی" بووبێت(..).

ئەم وتارەی من هیچی ناوێت جگە لەوەی ئەو پرسیارە بخاتەروو: ئایا دەتوانین کوشتنی پلان بۆدارێژراوی چەندین ملیۆن لەوانەی کە ئەمرۆ هەموو شتێکیان لەمەڕ دەزانین بەجۆرێك راڤەبکەین، وەك ئەوەی هەڵەیەك بووبێت لەروانگەی مێژوو(وجود)ەوە. وای لێ تێگەیشتن کە چارەنووسە؟ ئاخۆ ئێستاو دوای بەسەرچوونی کاتێکی زۆر بەسەر ئەمەدا سەرەڕۆیی ناکەین بە بەرنگاربوونەوەی ئەوەی روویداو بەرووبەرووبوونەوەی ئەوەیش کە ئێمە چی بووین؟(..). پێموایە ئێستا کاتی ئەوە هاتوو لەگەڵ هایدگەردا دژی هایدگەر بیربکەینەوە.

تێبینی:ئەو بابەتە لە گۆڤاری نما ژمارە (٤)ی ٢٠٠١ بلاوکراوەتەوە



## بڵاوکراوەکانی نما ٢٠٠٣

**مۆدێرنەکان**......
و: **ئازاد بەرزنجی**

**قوتابخانەی فرانکفۆرت**....
و: **ئیسماعیل کوردە**، **رێبین رەسوڵ ئیسماعیل**، **نووری بێخاڵی**

**مارتن هایدگەر**
و: **ئیسماعیل کوردە**

**سوننەت**، **مۆدێرنە** ، **پۆست مۆدێرنە**
و: **راسان موختار**

**دەربارەی عەلمانیەت**
و: **کۆمەڵە نوسەرێك**





## بەرهەمە چاپکراوەکانی وەرگێڕ

١-مۆمیای عەرشی سپێدەیەك / شیعر/ ٢٠٠٠
٢-چەپ، دیموکراسیەت، خۆبەئیسلامکردووەکان/ وەرگێڕان/ ٢٠٠٠
٣-گیروگازی چەمکی کۆمەڵی مەدەنی/ وەرگێڕان/ ٢٠٠٠
٤-دیموکراسیەت جیاوازیو پێکەوەژیان/ ٢٠٠١/ نووسینو وەرگێڕان
٥- قوتابخانەی فرانکفۆرت/ ٢٠٠٣/ وەرگێڕان

